## مەبەست لە زنجیرەی هزری هاوچەرخی ئیسلامی

- دەوڵەمەندکردنی کتێبخانەی کوردییە بە گرنگترین و کاریگەرترین دەقی ئەو کتێبانەی کە مەشغوڵی سەرینی هزری هاوچەرخی ئیسلامین .
- ئاشناکردنی خوێنەرو لاوی موسڵمانی کوردە بە دەقی ئەو کتێبانەی کە سەرچاوەن بۆ رۆشنبیری ئیسلامی و سازێنەری رابوونی ئیسلامین .
- شارەزاکردنی راستەوخۆی لاوی کورد بەم سەرچاوانە ، ئازادکردنیان لە گشت کۆت و بەندو بۆچوونی تەسکی حزبایەتی و تاکرەوی و رەوتگەرایی .
- بناغەیەک بێ بۆ بنیادنانی کەسایەتیەکی ئیسلامی بە هێز بۆ هەرتاکێکی موسڵمانی کورد ، تا توانای ئەنجامدانی ئەو گۆرانکاریانە هەبێ ، کە خوای پەروەردگار پێی سپاردوە .

دەگەڵ رێزو تەقدیرمان بۆ بیرو رای نوسەرانی ئەم زنجیرەیە ، مەرجیش نیە ئێمە پابەندی هەموو بیرو بۆچونەکانیان بین .

با دەستورێشمان لە وەرگرتن فەرمایشتەکەی خوای پەروەردگار بێت :

ٱلَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ ٱلْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُۥٓ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَىٰهُمُ ٱللَّهُ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمْ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿١٨﴾ سورة الزمر

التفسير

ناوی کتێب: شایەتمان
نوسەر: سەعید حەووا
وەرگێرانی: ئازاد نجم الدین
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/ هەولێر
خـــە ت: نەوزاد کۆیی
بەرگ : أمین مخلص
نەخشە سازی ناوەوە شنۆ حمدامین
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز
تـــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ١٩٢٤) ی ساڵی ٢٠٠٨ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٢٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## پێشکەشە بە

- ئەوانەی لە بواری بانگەوازی ئیسلامیدا کار دەکەن.
- ئەوانەی دەیانەوێت لە ڕاستی تێ بگەن.

بسم الله الرحمن الرحيم

انَّ الحَمْدَ للهِ نَحْمَدُهُ ونَسْتَعِينُهُ ونَسْتَغفِرُهُ، ونَعوذُ باللهِ مِنْ شُرورِ أنْفُسِنا ومِنْ سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلِ فَلا هادِيَ لَهُ. وأشْهَدُ أنْ لا الهَ إلا اللهُ وأشهَدُ أنَّ محمداً عَبدُهُ ورسُولُهُ.

يا أيُّها الذينَ آمَنوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِهِ ولا تَمُوتُنَّ إلاّ وأنتُمْ مُسلِمونَ

يا أيُّها النَّاسُ اتَّقُوا ربَّكُمُ الذي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ واحِدةٍ وخَلَقَ مِنها زَوجَها وبَثَّ مِنهُما رِجَالاً كَثيراً ونِساءً واتَّقُوا اللهَ الذي تَساءَلُونَ بِهِ والارْحَامَ إنَّ اللهَ كانَ عليكُمْ رَقيباً،

يا أيُّها الذينَ آمنوا اتقوا اللهَ وقُولوا قَولاً سَديداً، يُصلِحْ لَكُمْ أعمالَكُمْ ويَغْفِرْ لَكُمْ ذُنوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللهَ ورسولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوزاً عَظيماً.

أمَّا بعدُ: فإنَّ أصْدَقَ الحَديثِ كِتابُ اللهِ، وخَيرَ الهَدي هَدْيُ محمدٍ ﷺ وشَرَّ الامُورِ مُحْدَثاتُها، وكُلَّ مُحْدَثَةٍ بِدْعَةٌ وكُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وكُلَّ ضَلالةٍ في النَّارِ.

## کورتەیەك لە ژیانی مامۆستا سەعید حەووا

### ناوی:

- سەعیدی کوڕی محمد دیب کوڕی محمود حەووای النعیمییە، لە ١٩٣٥/٩/٢٧ لە شاری حەمای سوریا لەدا بووە، لە ژێر سەرپەرشتی باوکیدا پەروەردە بووەو خێزانەکەیان هەر لە زووەوە بە چاندن و بازرگانیەوە خەریك بوون.

### خوێندنی:

- ئامادەیی لە شاری حەماو کۆلیجی شەریعەتی لە دیمەشق تەواو کردووە

مامۆستایەتی:

- لە ساڵی ١٩٦٦ - ١٩٧٠ مامۆستای پەروەردە و زمانی عەرەبی بوو لە سعودیە .

- لە ١٩٧٠-١٩٧٣ ش لە سوریا هەر مامۆستایەتییەکەی کردووە.

### چالاکی سیاسی:

- ساڵی ١٩٥٢ چۆتە ڕیزی (الاخوان المسلمون)ەوە .

- ساڵی ١٩٧٣ - ١٩٧٨ لە سوریا زیندان بووە لەسەر ئەو (بیان الدستور)ەی کە سەرانی ڕابوونی ئیسلامی لە سوریا نووسیان بۆ بە ئیسلامی کردنی سیستمی حوکمی سوریایی.

- ساڵی ١٩٧٩-١٩٨٢ یەکێك بوو لە سەرکردایەتی ئیخوان لە سوریا .

- ساڵی ١٩٨٢ - ١٩٨٤ یەکێك بوو لە شورای ڕێکخراوی نێو دەوڵەتی ئیخوان.

- ساڵی ١٩٨٥ - ١٩٨٧ یەکێك بوو لەسەرکردایەتی شوڕای سوریا.

ـ لە تەمەنی ئەودا ئیخوانی سوریا بوونە پێنج گرووپی جیاواز، بۆیە ئەویش لە دوو ساڵی کۆتایی تەمەنیدا وازی لە ئیخوان هێنا!

دیدو بیری: باوەڕی وا بوو کە کۆمەڵکاری ئیسلامی نوێ پێویستە لەسەر چەند بنچینەیەك دابڕێژرێت، لەوانە:

* هەر وڵاتەو ڕێکخستنی خۆی جودا بێت.

* هەوڵ بدرێت ئوممەتی ئیسلامی یەکخرێتەوە.

* پلەی خیلافەتی ئیسلامی زیندوو بکرێتەوە.

**بەرهەمەکانی:**

ـ الاساس فی التفسیر(١١بەرگی گەورەیە).

ـ الاساس فی السنه(١٤بەرگی گەورەیە).

ـ الأساس في قواعد المعرفة وضوابط الفهم للنصوص.

ـ زنجیرەی التربية والتزكية (وەکو: تربيتنا الروحيتو المستخلص في تزكية الأنفس).

ـ زنجیرەی الاصول الثلاثة: الله جل جلاله، الرسول، الاسلام (٣ بەرگی گەورەیە).

ـ زنجیرەی فقه الدعوة والعمل الاسلامي (وەکو: جند الله ثقافة وأخلاقاً، من أجل خطوة إلى الأمام على طريق الجهاد المبارك، في آفاق التعليم).

ـ جگە لە کتێبی تری جیاوازی وەکو: المدخل دعوة الاخوان المسلمون، هذه تجربتي... وهذه شهادتي، عقد القرن الخامس عشر الهجري القادم.

وەفاتی: لە کۆتایی ژیانیدا تووشی نەخۆشیەکی سەخت بوو، کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەسەر جێگا مایەوەو زیاتر لە سێ مانگ زمانی شکا، تا لە ڕۆژی ١٩٨٩/٣/٩ لە نەخۆشخانە لە شاری عەممانی پایتەختی ئەردەن کۆچی دوایی

کرد... رحمه الله ـ مامۆستا سەعید یەکێکە لـە ئیخوانـە سـۆفیەکان، بـەڵام بـە چاوێکی کراوەو خواناسیەوە، خاڵیش نییە لە هەندێ بیدعە... بەڵام بە تەئکید بـۆ خۆی مەدرەسەیەکی سەربەخۆیەو بە دەردی شێخ زوهـەیر الشاویـشی بەڕێوەبـەری المکتب الاسلامی دەربارەی دەڵێ: سەعید حەووا یەکێکە لەو داعیە سەرکەوتوانەی ناسیومن، چونکە لە ماوەی تەمـەنێکی کەمـدا، کـە(٥٧)سـاڵ بـوو تـوانی ئـەو زانیاری و فیکرەی هەیەتی بە خەڵکێکی ئێجگـار زۆری بگـەیێنێت، ئـەو هـەموو نووسینەی کە لەو تەمەنـەی خۆیـدا نووسـینی دەیپـاڵێون بـۆ ریـزی نوسـەرە زۆر نووسەکانی سەردەم...

مامۆستا خوا لێی خۆشبێ خۆی لە نوسینەوەی ژیانی خۆیـدا نوسـیویێتی، کـە عەرەبم کەچی بەداخەوە هەندێك ئیـسلامی (کـوردی دیـد قـەومی) هـەر دەڵـێن کوردە!!

## پێشەکی وەرگێڕ

سەعید حەووا - خوا لێی خۆشبێت - خۆی ئەم زنجیرە کتێبە(الله، الرسول، الاسلام)ی ناو ناوە (الاساس)، چونکە بە بناغە سەرەکیەکانی تێگەیشتنی ئیسلامی دەبینی، ئەمەش بێگومان هەر وایە، چونکە تێگەیشتنی ئەو سێ ڕوکنە سەرەکیەی باوەڕ هەموو ئیسلامەکەیان لەسەر دادەمەزرێت... ئەم زنجیرە کتێبە هەر چەندە زیاتر لە ٣٠ساڵ بەسەر نووسین و بڵاو کردنەوەیاندا تێپەڕیووە، بەڵام گرنگی و کاریگەری خۆیان هەر ماوەو، (والله اعلم) هەر دەشیان مێنێت، چونکە ئەم کتێبانە ئەو سێ ڕوکنە هەم لە ڕوی فیکرییەوە دەخاتە ڕو، هەم لە ڕوی زانستی شەرعییەوە، بۆیە هەر بە یەکێك لە سەرچاوەکانی فیکری ئیسلامی دەمێنێتەوە... ئەمە جگە لەوەی لە هەندێك شوێندا نووسەری گەورە دیدو بۆچونی خۆی دەربارەی زۆر مەسائیلی نوێ ڕون کردۆتەوەو ئیجتیهادی لە هەندێك باسی سەردەمیشدا کردووە، کە جێی ڕێزە، چونکە پەی پێ بردنێکی وردە... ئەمانەش پاڵنەری سەرەکیم بوون بۆ وەرگێڕانی بۆ کوردی...

بیستوومە کە کتێبی یەکەم(الله) کراوە بە کوردی و نوسینگەی تەفسیر لە هەولێر بڵاوی کردۆتەوە، بەڵام وا دەزانم هێشتا کتێبی (الرسول)ەکە دەسکاری نەکراوە، منیش دەمێك بوو بەشێکی(الاسلام)ەکەم کرد بوو بە کوردی، بەڵام ساڵانێکی زۆر تێیدا وەستام، دەترسام دەرەقەتی وەرگێڕانەکەی نەیەم، یان دەرفەتیم نەبێت و، خەڵکێکی تریش نەیکات بە کوردی، بەو ئیعتیبارەی من خەریکیم، هەندێك براش هەبون ساردیان دەکردمەوەو دەیانووت: کەی باوی ئەم جۆرە کتێبانە ماوە؟!! تا لەم ماوەی ڕابووردودا هیممەتێکی ترم دایەوە بەر خۆم و کەوتمەوە پێدا چوونەوەی و خەریك بوون بە وەرگێڕانی.

ئەو کەسەی بە چاوی ڕەخنەی سەلەفیانەوە بڕوانێتە سەعید حەووا، شەیتان وای لێ دەکات هیچ کتێبێکی نەخوێنێتەوە! لە کاتێکدا ئەوانەی کە بەردەوام ڕەخنەی زۆر توندیان لە سەعید حەووا گرتووە ـ وەکو سەلیم الهلالی ـ ڕەخنەیان لەم سێ کتێبەی نەگرتووە، بەڵکو لە کتێبی تری وەکو کتێبی(تربیتنا الروحیة)، کە لە دیدێکی سۆفیانەوە باسی پەروەردەی نەفس و زیکرەکانی خوای گەورە دەکات، ئەمەش بابەتێکە کە ئێمەش ڕەنگە لایەنگیری هەندێك بۆچوونی الهلالی بین تێیدا... بەڵام بە ڕاستی حەیفە موسوڵمان لەسەر دێڕە ڕەخنەی کەسێك لە کەڵە پیاوێکی ئاوا، خۆی مەحروم کات لەو هەموو ڕۆشنبیرییەی، کە سەعید حەووا پێشکەشی کردووە... من گومانم لەوەدا نییە کە سەعید حەووای ڕەحمەتی مەدرەسەیەکی سەربەخۆی ئیخوانییە، خاوەن دیدی ڕوون و هەڵوێستی پڕ جورئەت و ئازایەتیی خۆیەتی...

کتێبی (الاسلام) ەکە زۆر گەورەیە، چوار بەرگی گەورەیە، ئەمەی ئێستا لەبەر دەستی خوێنەرانی بەڕێزدایە(٨٥)لاپەڕەی ئەسڵی بەرگی یەکەمە، زیاتر لە١٠٠ لاپەڕەی تری ماوە، کە دەربارەی چوار ڕوکنەکەی ترە (نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) کە (ان شاء الله) ئەوانیش دەخەینە بەر دەست، بەڵام وامان بە باش زانی خوێنەرانی کورد لەوەی کراوە بە کوردی، بێ بەش نەکەین، بە چاوەڕوان کردنی، تا هەموو بەرگی یەکەم تەواو دەبێت...

خوای گەورە سەعید حەووا بە بەهەشتی خۆی شاد کات و پاداشتی بداتەوەو ئێمەش و ئێوەش سەرکەوتوو بکات... ئامین .

ئازاد نجم الدین

## پێشەکی نوسەر

١- ئیسلام دینی هەموو پێغەمبەران و نێرراوانی خوایە، هەر لە ئادەمەوە تا دەگاتە پەیامەکەی محمدﷺ کە کۆتایی بە پەیامە ئاسمانییەکان هێناوە. خوای گەورە - وەك لە قورئاندا دەردەکەوێت - زۆر بایەخی بەم ڕاستییە داوەو سوور بووە لەسەر ڕوون کردنەوەی. وەك لەسەر زمانی نوح دەفەرموێ: ﴿ وَأُمِرْتُ أَنْ أَكُونَ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾یونس/٧٢ واتە: فەرمانم پێ دراوە، کە لە موسوڵمانان بم. لەسەر زمانی ئیبراهیم و ئیسماعیلیش دەفەرموێ: ﴿ رَبَّنَا وَٱجْعَلْنَا مُسْلِمَيْنِ لَكَ ﴾ البقرە/١٢٨ واتە: خوایە بمانکە بە دوو موسوڵمانی خۆت. وە لە ڕاسپاردەکەی یەعقوبدا کە بۆ کوڕەکانی کرد، دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱصْطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾البقرە/١٣٢ واتە: خوای گەورە دینی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، دە ئێوەش بە موسوڵمانێتی بمرن. لەسەر زمانی موسا دەفەرموێ:﴿فَعَلَيْهِ تَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّسْلِمِينَ ﴾یونس/٨٤ واتە: مادام وایەو گەر موسوڵمانن، پشت بەو ببەستن. کە باسی تەوراتیش دەکات دەفەرموێ: ﴿يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ ﴾المائدە/٤٤ واتە: ئەو پێغەمبەرانەی کە تەسلیم بە خوا بوون ئەوانە حوکمی پێ دەکەن. لەسەر زمانی یوسفیش دەفەرموێ: ﴿تَوَفَّنِى مُسْلِمًا وَأَلْحِقْنِى بِٱلصَّـٰلِحِينَ ﴾یوسف/١٠١ واتە: بە موسوڵمانێتی بمرێنەو بە پیاوچاکانم بگەێنە. لەسەر زمانی سیحربازەکانی فیرعەون - کە باوەڕیان بە پێغەمبەرێتی موسا هێنا، فەرموی: ﴿رَبَّنَآ أَفْرِغْ عَلَيْنَا صَبْرًا وَتَوَفَّنَا

مُسْلِمِينَ ﴾الاعـراف/١٢٦ واتـە: خوایـە ئـارامی خۆتـان بەسـەردا ببارێنـەو بـە موسوڵمانێتی بمانمرێنـە. لەسـەر زمـانی یـاوەر (حـەواری)یـەکانی دەرووری عیـسا دەفەرمویّ: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشْهَدْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ ﴾آل عمران/٥٢ واتـە: ئێمـە باوەڕمان بە خوا هێناوە تۆش شاهیدی بدە کە ئێمـە مـسوڵمانین. لەسـەر زمـانی شاژنی سەبەو (بەلقیسی یەمەن) کە باوەڕی بە خوا هێنا، دەفەرموێ: ﴿وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾ النمـل/٤٤ واتـە: لەگـەڵ سـولەیماندا بـۆ خـوای پەروەردگاری جیهانیان مسوڵمان بووم. لە دوعای پیاوچاکەکەشدا دەفەرموێ: ﴿إِنِّي تُبْتُ إِلَيْكَ وَإِنِّي مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ الاحقـاف/١٥ واتـە: خوایـە پیاوچـاك لـە وەچـەو نەوەکەم دروست بکە، من تۆبـەم کـردووەو بـۆ لای تـۆ گەڕاومەتـەوەو لـە ڕیـزی موسوڵمانانم...

لە حەدیسی سەحیحیشدا هاتووە کە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((الانبیاءُ إخوةٌ، أبناءُ علّات، أمهاتُهم شتّى ودينُهم واحدٌ)) دوو شێخەکەو ئەبو داوود گێڕاویانەتەوە. واتە: پێغەمبەران هەموویان برای یەکن، باوکیان یەکەو دایکیان جیاوازەو دینەکەشیان یەکە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ وَمَا وَصَّيْنَا بِهِۦٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ أَنْ أَقِيمُوا۟ ٱلدِّينَ وَلَا تَتَفَرَّقُوا۟ فِيهِ ﴾الشوری/١٣ واتە: خوای گەورە لەو یاساو ئەحکامە دینییانەی بۆ ئێوەش کردۆتە بەرنامە کە نووحی پێ ڕاسپارد بوو، هەروەها ئەوەش، کە بە وەحی بۆ خۆت و بۆ ئیبراهیم و موساو عیساشی نارد، کە: دینەکە پایەدار کەن و بیچەسپێنن و لە نێوان خۆتاندا جیاوازی و ناکۆکیتان تێ نەکەوێت...

٢ـ ئیسلام لە ڕووی زمانەوانییەوە مانای خۆ بەدەستەوەدان و تەسلیم بوونە بە خوای گەورە، بە جێبەجێ کردنی سەرپشکانەی (اختیارانە) ی فەرمانەکانی و بە توخن نەکەوتنی بەرهەڵستیەکانی. ئەمانەش لە وەحیدا دیاری کراون. هەر کەسێك دڵ و دەروونی لە هەموو کاروبارێکیدا تەسلیمی خوا بکات، ئەوە بە موسوڵمان دەژمێررێت. پێغەمبەران و نێرراوانی خوا لە هەموو کەسێك زیاتر خۆیان تەسلیمی خوا کرد بوو، بۆیە بە یەکەمین موسوڵمان دەدرانە قەڵەم. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قَالَ سُبْحَانَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُؤْمِنِينَ﴾ الاعراف/١٤٣ واتە: ووتی (موسا فەرمووی): پاك و بێ خەوشی بۆ تۆ، تۆ بەم کردووە و پەشیمان بوومەتەوە، من یەکەمینی موسوڵمانەکانم.

بە بێ ئەم خۆ تەسلیم کردنەش ـ کە دەبێ لە هەموو هەڵس و کەوتێکدا دەربکەوێت ـ کەس بە موسوڵمان ناژمێررێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا ﴾ النساء/٦٥ واتە: سوێند بە خواکەت، باوەڕیان دانامەزرێت و بە موسوڵمان حسێب نابن تا تۆ نەکەنە حاکم و داوەر لەو کێشەو ناکۆکیانەی لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، جا کە تۆ حوکمت کردن هیچ گرێ و گۆڵێك لە دڵ و دەروونیاندا نامێنێت و ئەوجا بە تەواوی خۆ تەسلیم دەکەن.

فەرمانی خوای گەورەش بە هۆی وەحیەوە دەزانرێت کە پێغەمبەری ڕاستگۆمانﷺ گەیاندوێتی، دوای زانینی ئەم ڕاستیەش خۆ تەسلیم کردن بە خوا شتێکی ئاسایی دەبێت، چونکە لە ناخی موسوڵمانەکەدا ئەو قەناعەتە دەچەسپێت کە خوا ئاگاداری هەموو ژیانەو شارەزای سروشتی مرۆڤە...

٣ـ مادام چاکسازی مرۆڤ و ڕاست کردنەوەی ڕەفتارو ڕەوشتی بە تەسلیم بوونێتی بە خوای گەورە، خواش هیچ نەتەوەیەکی نەهێشتۆتەوە کە نێرراوی خۆی

بۆ نەناردبن، وەك خۆی دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ فاطر/٢٤
واتە: نەتەوە نییە پێغەمبەرێکی بۆ نەچوو بێت. هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ﴾ النحل/٣٦
واتە: پێغەمبەرمان بۆ هەموو نەتەوەیەك ناردووە تا پێیان ڕاگەیێنن کە هەر خوا بپەرستن و توخنی تاغوت نەکەون. هەروەها: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ﴾ ابراهیم/٤ واتە: هەر پێغەمبەرێکمان ناردبێت هەر بە زمانی گەلەکەی خۆی بووە تا هەموو شتێکیان بۆ ڕوون بکاتەوە.
پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((أنتم تُتِمُّون سبعينَ أمَّةً، وأنتم خيرُها وأكرمُها على الله)) ترمذي گێڕاویێتیەوە. واتە: ئێوە حەفتاهەمین نەتەوەن و لای خواش ئێوە چاکترین و بەڕێزترینیانن.

لە مەوە هەڵەی گومانی ئەو کەسەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دەڵێ: پێغەمبەران تەنها بۆ چەند نەتەوەیەك هاتوون، بانگەوازەکەشیان هەر بۆ چەند ناوچەیەك بووە! بەڵام ڕاستییەکەی پێچەوانەی ئەمەیە. گەرچی ئێمە خۆشمان پێغەمبەری هەموو نەتەوەکان نازانین هەر ئەوانە دەزانین، کە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بۆی باس فەرمووین. بۆ نموونە فارسەکان ڕایان وایە کە پێغەمبەرێکیان هەبووە ناوی زەردەشت بووە، ئێمە لەوە دڵنیاین کە فارسەکان پێغەمبەریان بۆ هاتووە، بەڵگەشمان ئەو ئایەتەیە کە خوای گەورە تێیدا دەفەرموێ: ﴿وَإِن مِّنْ أُمَّةٍ إِلَّا خَلَا فِيهَا نَذِيرٌ﴾ فاطر/٢٤ واتە: نەتەوە نییە پێغەمبەرێکی بۆ نەچوو بێت. هەروەها قسەکەی ئیبنو عەبباس کە دەڵێ: خەڵکی ناوچەی فارس کە پێغەمبەرەکەیان کۆچی دوایی کرد، ئیبلیس ئاگرپەرستی لا پیرۆز کردن.

٤ـ بە دوو شت دەوترێت ئیسلام :

* بەو دەق (نص)انەی کە خوای گەورە بە وەحی بـۆ ڕوون کردنـەوەی دیـن بـە پێغەمبەراندا ناردوێتییە خوارەوەو، ئەوانیش ئاشکرایان کردووەو بۆ خەڵکیان ڕوون کردۆتەوە.

* بە کارو کردەوەکانی مرۆڤێکی موسوڵمان، کە بە ئەندازەی پێویست بـاوەڕو خۆبەخوا تەسلیم کردنی تێدا هاتبێتە دی .

ئیسلامیش بە پێی مانای یەکەم ڕادەی زۆری و فراوانی لە پێغەمبەرێکەوە بـۆ پێغەمبەرێکی تر جیـاوازە، بـەڵام هـەموویان سەرچـاوەکانیان یەکـە. بۆیـە ئـەو ئیسلامەی بۆ موسا هاتووە فراوانترە لەوەی بۆ نووح هاتووە. چونکە خوای گـەورە دەربارەی تەوراتەکەی موسا دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا لَهُۥ فِى ٱلْأَلْوَاحِ مِن كُلِّ شَىْءٍ مَّوْعِظَةً وَتَفْصِيلًا لِّكُلِّ شَىْءٍ ﴾ الاعـراف/١٤٥ واتە: خوا فەرمانی بە موسا دا، کە لەسەر تەختە قوڕی سوورەوە کراوە، پەیامەکـەی ـ کـە دەربـارەی هـەموو شتێك و ئامۆژگاری هـەموو بۆنەیـەکی تێـدا بـوو ـ بنووسـێتەوە. ئیـسلامەکەی محمدﷺلە ئیسلامی پێغەمبەرانی تر فراوانترە، چونکە پێغەمبـەرانی پـێش ئەوـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ هەر یەکە بۆ گەلی خـۆی هـاتووە، بـەڵام محمـدﷺ بـۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووەو پەیامەکەشی بۆ هەموو کات و شوێنێك و بـۆ هـەموو ئەوەی مرۆڤایەتی گشتییە. ئەمەش ئەوەی پێویست کردووە کە پەیامەکەی ئەم لە هـی ئـەوانی تـر بـەرفراوانتر بێـت. ئـەوەتا خـوای گـەورە لـە باسـی قورئانـدا فەرمویـەتی:﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴾ النحل/٨٩ واتـە: ئـەو قورئانـەی بۆمـان ناردویـت، ڕوون کردنـەوەی هەموو شتێکی تێدایە و ڕێنمایی و بەزەیی و مژدەیە بۆ موسوڵمانان...

٥ـــ بـە پەیامەکـەی محمـدﷺ کۆتـایی بـە پـەیام کۆتـایی بـە پـەیامی و پێغەمبەرایەتی هات، بۆیە خوای گەورە ڕێنمـایی ئێمـەی بـۆ ئـەوە کـردووە، کـە لەسـەر ڕێبـازی نێرراوانـی خـوا بـڕۆین: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُۖ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ﴾ الانعـام/٩٠ واتە: ئەوانە ئەوانەن کە خودا ڕێنمایی کردوون، تۆش لەسەر ڕێنمـاو ڕێبـازی ئـەوان بـڕۆ، هـەروەها دەفـەرموێ: ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ النساء/٢٦ واتـە: خـودا ڕێنماییتـان بەروە ڕێبازی ئەوانەی پێش خۆتان دەکـات(ڕێبـازی پیاوچـاکان) ئـەوەی پێویـست بوویێت لە ڕێباز و پرۆگرام و سیستم، خوای گـەورە بـۆی تـەواو کـردووین:﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًاۚ﴾المائدة/٣ واتە: ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ تەواو کردن و بەهرەی خۆمم بـە تـەواوی بـە سـەرتاندا ڕشت و ڕازیم ئیسلام دین(بەرنامەی ژیان) تان بێت.

پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((مَثَلي ومَثَلُ الانبياءِ قَبْلِي كَمَثَـلِ رَجُـلٍ بَنَـى بَيتَـاً فَأحْسَنَهُ وأجْمَلَهُ إلّا مَوضِعَ لَبَنَةٍ مِـنْ زاويـةٍ مِـن زوايـاهُ فَجَعَـلَ النـاسُ يطوفـونَ بـهِ ويَعجَبونَ لَهُ ويقولونَ: هَلّا وُضِعَتْ هذهِ اللبِنة، فأنا تِلْكَ اللبنةُ وأنـا خـاتِمُ النبـيينَ)) بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە. واتە: نموونەی من و پێغەمبـەرانی پـێش مـن وەك ئەوە وایە: کابرایەك خانوویەکی زۆر جوان و ڕێك و پێك دروست کرد بێـت، تـەنها جێگەی خشتێك نەبێت لە گۆشەیەکی خانووەکەدا بە بەتاڵی مابێتەوە، ئینجا کـە خەڵکی بە دەورەی خانووەکەدا بێن و بچن و لە خانووەکە سەرسـام بـن، بـەڵام بـۆ خشتە نوقسانەکە بڵێن: ئای خۆزگە ئەو خشتەش لە جێی خۆی دابنرایاتەوە، ئەوە من ئەو خشتەم، منیش کۆتا پێغەمبەرم ..

لەبەر تەواوێتی ئیسلامە، کە داوا لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کراوە، کە شوێن ئیسلام بکەون، بۆیە بەمیش هەموو دینەکانی تر کۆتاییان پێ هاتووە، ئیتر لەمە بە دواش هەرگیز شەریعەتێکی تر دوای ئیسلام نایەت، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ الاحزاب/٤٠ واتە: خۆ محمدﷺباوکی کەسێك لە ئێوە نەبوو، هەر نێرراوێکی خوا بوو، کە کرا بە کۆتای پێغەمبەران. یان: ﴿ قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّى رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُمْ جَمِيعًا ﴾ الاعراف/١٥٨ بلێ: خەڵکینە من نێرراوی خوام و بۆ هەر هەموو ئێوە نێرراوم. هەروەها: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَذِيرًا ﴾ سبأ/٢٨ تۆمان بۆ هەموو خەڵکی ناردووە تا هەم مژدەدەر بیت هەم ئاگادارەدەر. ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَٰلَمِينَ﴾الانبیاء/١٠٧ واتە: تۆ ڕەحمەتیت و ئێمە بۆ هەموو جیهانمان ناردوویت﴿ وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾ال عمران /٨٥. هەروەها:﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلْإِسْلَٰمُ ﴾ال عمران/١٩ واتە: ئایین لای خوا هەر ئیسلامە .

هەر کەسێك شوێن پێغەمبەرﷺنەکەوێت گومڕاو سەرگەردانەو حەتمەن سەری بەفەتارەت دەچێت. بۆیە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((والذي نَفْسِي بيدِهِ، لا يَسْمَعُ بي أحَدٌ مِنْ هذهِ الامَّة، يهوديٌ ولا نَصرانيٌّ ثُمَّ لايُؤمنُ بالذي أُرْسِلْتُ بِهِ إلا كانَ مِنْ أصحابِ النَّارِ)) ئیمامی موسلیم گێڕاوێتیەوە. واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر کەسێك لەم نەتەوەیە (ئەو نەتەوەی وەڵامی پەیامی پێغەمبەرﷺدەداتەوە) پەیامەکەی ببیستێت ـ جولەکە بێت یان مەسیحی ـ ئەگەر باوەڕم پێ نەهێنیت، ئەوە جێگای ئاگری دۆزەخە... خوای گەورەش

دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ النساء/١١٥ واتە: ئەو کەسەی بە ئاڕاستەیەکی پێچەوانە بە ئاڕاستەی پێغەمبەرﷺ بجولێتەوەو ڕێبازێکی تر ـ جگە لە ئاییەنەکەی ئەو ـ بۆ ژیانی بگرێتە بەر، یان ڕێبازێکی تری غەیری ڕێبازی موسوڵمانان لە ژیانیدا بگرێتە بەر، یان سیستم و بەرنامەیەکی تری غەیری ئیسلام بچەسپێنیت، ئەو کەسە کافرەو دەخرێتە دۆزەخەوەو بە نەمری هەتا هەتایە لە ئاگری دۆزەخدا دەمێنێتەوەو چارەنووسی زۆر خراپ دەبێت. یان دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٍ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ النساء/١٥٠واتە: ئەو کەسانەی کافرن و باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکانی نەهێناوەو دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان باوەڕ هێنان و دەڵێن باوەڕ بە هەندێك پێغەمبەرو پەیام دەهێنێن و باوەڕ بە هەندێکی تر ناهێنین و دەیانەوێ ڕێگایەکی تر لە نێوانی کافر بوون و موسوڵمان بووندا بدۆزنەوە! ئەوانە بەڕاستی کافری تەواون...

ئەو ئیسلامەی بۆ پێغەمبەرانی پێشوو هاتبوو بیر چوونەوە، لێیان لادراوە یان زیادەیان خراوەتە سەر، ئاڵ و گۆڕیان بەسەردا هاتووە، خاڵە سەرەکیەکانی هەقخوازییان لێ سڕراوەتەوەو ناهەقییان خراوەتە جێ، شوێن کەوتووەکانیشیان لەسەر ئەو گۆڕاوانە پەروەردە کراون، بۆیە وا وێڵ و گومڕان جا ئیدی ئەو گۆڕان و لادانە لە باسەکانی عەقیدەدا بوو بن، یان لە دروشمی خواپەرستی، یان لە باسەکانی ئەحکامی شەریعەت و چۆنیەتی ڕەفتار... ئەگەر ئێمە زانیمان و لەوە دڵنیا بووین، کە غەیری قورئان کتێبێکی تری ئاسمانی بە سەلامەتی نەماوە و، فەرمایشتەکانی پێغەمبەرمان بۆ پاك بووەوەو ڕاستەکانی کەوتنە بەر دەستمان،

ئەو کاتە زیاتر هەست دەکەین کە مرۆڤایەتی بۆ رزگار بوونی لە کێشەکانی دەبێت ڕێگای تەسلیم بە خوا بگرێتە بەر، پێویستە شوێن محمدﷺ بکەوێت. ئەگەرچی مرۆڤایەتی لەمەدا خۆ سەرپشك (موخەییەر) نییەو غەیری ئیسلامیش هەرچی بیروباوەڕو بەرنامەو ئاینێکی تر بگرێتەر بەر لێی وەرناگیرێت... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴾ المائدة/١٩ واتە: ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانیەکان وا پێغەمبەرەکەمان هاتە لاتان، دوای ئەوەی ماوەیەکە وەحی خوایی بڕاوە (نێوان عیساو محمد سەلامی خوایان لێ بێت) دوایی لە ڕۆژی قیامەتتدا نەڵێن: مژدەرێك یان ئاگادار دەرێکمان نەدی بۆمان بێت! کەس نەهات تا پەیامی خوامان پێ بگەیێنێت! وا مژدەدەر و ئاگادار کەرەوەمان بۆ ناردن، خوا بەسەر هەموو شتێکدا بەتوانایە.

٦ـ ئەو ئیسلامەی کە پێغەمبەرﷺ بانگەوازەکەی بڵاو دەکردەوە بە هۆی قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەرەوەﷺ دەزانرێن، شارەزا بوونیش لە سوننەت شارەزا بوونی ڕێساکانی زانستی حەدیس دەخوازێت کە زانا رەخنەگرەکانی حەدیس (نقاد الحديث) دایان رشتووە.

ئیسلام ڕێنماییەکی تەواو گشتگیری هەموو ژیانی مرۆڤایەتییە، چونکە خوای کردگارو کارزان کردوێتی بە بەرنامەی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی، ئەو بە زانستی خۆی وای بۆ دارشتوون کە هەموو کونجێکی ژیانیان بگرێتەوە، هیچ مەسەلەیك لە بوون و گەردوون و ژیاندا نەماوە ئیسلام رای خۆی لەسەر نەدا بێت و پێناسەی حەقیقەتی ئەو شتەی ڕون نەکردبێتەوە، بە دەرخستنی ماهییەتی شتەکان بە کاریگەرییان، ئینجا بە هەڵوێستی ڕاست وەرگرتن بەرامبەریان... ئەوە حەڵاڵە و، حەرامە، ئەو شتە جائیزە، ئەوی تریان ناشێت، ئەمە فەرزە، ئەویان سوننەتە...

ئیتر ئەمانە لەهەر لایەنێکی ژیاندا بن: عەقیدە بن یان پەرستن، مامەڵە بن یان ڕەفتار، سیاسەت بن یان ئابوری، کۆمەڵایەتی بن یان لایەنەکانی جەنگ و ئاشتی، یاسا دانان بن یان جێ بەجێ کردنیان... خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ﴾ النحل/٨٩ واتە: قورئانەکەی کە بۆمان ناردوویەت ڕوون کردنەوەی هەموو شتێکی تێدایە. هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَتَفۡصِيلَ كُلِّ شَيۡءٖ﴾یوسف/١١١ واتە: باسی هەموو شتێکی بە دوور و درێژی تێدایە... هەر شتێکیش لە قورئان و سوننەتدا نەبێت (وەکو ئەوەی پاش تەواو بوونی ئەوان دەرکەوتبێت) ئەوە زانایان راو بۆچوونی خۆیانی لەسەر دەدەن... رای ئەوانیش هەر لەو ڕێسا گشتیانەوە دێت کە قورئان و سوننەت خۆیان دایانڕشتووە، ئەمەش موجتەهیدەکان دەیزانن[1]..

لە قورئان و سوننەتدا هەموو باسەکانی عەقیدەو خواپەرستی و کێشەکانی سامان و ماڵ و کێشەی کۆمەڵایەتی و جەنگ و ئاشتی و کێشەکانی یاسا دانان و جێبەجێ کردنیان و، هەورەها کێشەکانی پەروەردە و ئاڕاستەو زانستی و فێرکردن، یان حوکم و دەسەڵات... هەمووی دیاری کراون، زانا شەرعناسەکان(الفقهاء) ئەم باسانەیان بۆ چەندین خانە پۆلێن کردووە وەکو: باوەڕ، خواپەرستی، ڕەفتارو ڕەوشت، سەوداو مامەڵە، سزاکان.

کێشەکانی حوکم و دەسەڵاتداریتی لە خانەی باوەڕهێناندان، باسەکانی نوێژو ڕۆژو و حەج و زەکات وان لە خانەی خواپەرستیدا، سەوداومامەڵەش دابەش

---

١ـ ئەو زانا شەرعناسانەن، کە حوکمی شەرعی لەسەر شتی نوێ دەدەن و یان مانای دەقەکان روونتر لێك دەدەنەوە، وەکو حوکم و فەتوای پێشەوایانی بەڕێزی وەکو ئەسحابەکان و تابعینی وەکو حەسەنی بەسری و ئەوزاعی، یان چوار پێشەوا ناسراوەکە: ئەبو حەنیفە و مالیك وشافیعی و ئەحمەد بن حەنبەل یان ئەوانەی دوای ئەوان وەکو ئیمامی ئیبنو تەیمیەو ئەو ئاستانە... (و).

دەبنەوە بۆ پێنج بازنەی تر: سامانداری، هاوسەرێتی، ناکۆکی، ئەمینداری، میرات... سزاکانیش پێنجن: تۆڵە سەندنەوە، سزای دزی، سزای زینا، سزای پاشگەز بوونەوە لە ئیسلام، سزای تۆمەتبار کردنی خەڵکی بە داوێن پیسی[1]...

۷- پێغەمبەرﷺبە زۆر شێوە پێناسەی ئیسلامی کردووە، هەندێك کەس لەم پێناسە جۆر بەجۆرانەی پێغەمبەرﷺباش تێنەگەیشتوون، چونکە پێغەمبەرﷺ زۆرجار پێناسەی کۆ (الكل)ی بە بەشێك (الجزء) کردووە، بۆ ئەوەی گرنگی ئەو بەشە دەست نیشان بکات. وەك دەفەرموێ: (الحج عرفة)[2] واتە: حەج کردن بریتییە لە ڕاوەستانەکەی کێوی عەرەفات. بێگومان ڕاوەستان لە سەرچیای عەرەفات و لە ڕۆژی عارفەدا هەموو حەجەکە نییە، بەڵکو بەشێکی حەجە، بەڵام لەبەر گرنگی ئەو ڕوکنە پێغەمبەرﷺئاوای دەربڕیووە، کەوا بوو چۆن ئەگەر کەسێك بڵێت: حەج کردن بریتییە لە ڕاوەستانی سەر شاخی عەرەفات بە هەڵە دا دەچێت، هەر بەو شێوەیەش هەر کەس وا بزانێت ئیسلام بریتییە لە چەند باسێکی پەرستن بە هەڵەدا چووە...

با چەند پێناسەیەکی ئاوا بۆ ئیسلام بهێنینەوە، تا زیاتر مەسەلەکە ڕوون بێتەوە:

پێناسەی یەکەم: تەلحەی کوڕی عوبەیدوالله دەگێڕێتەوە کە ((جاءَ رَجُلٌ إلى رسولِ اللهِ صلى الله عليه وسلم يَسْأَلُ عن الإسلام فقال رسول الله صلى الله عليه

---

۱- بڕوانە کتێبی (حاشيه ابن عابدين).

۲ - نوسەر بەڕەحمەت بێت لە پەراوێزدا دەربارەی ئەم حەدیسە نووسیوێتی: (أخرجه أصحاب السنن ورمز السيوطي لصحته)، حەدیسەکەش رواه الخمسة وابن حبان والحاكم، نيل الأوطار (إعلاء السنن ۱۰/۱۸۲-۱۸۳) لە ڕیوایەتی تریشدا هاتووە: (الحج عرفة) رواه الترمذي عن عبدالرحمن بن يعمر، سوفیانی کوڕی عوبەینە دەفەرموێ: ئەمە ڕاسترین حەدیسە سوفیانی سەوری گێڕابێتیەوە...

وسلم: خمسُ صلواتٍ في اليوم والليلةِ فقال هل عَلَيَّ غيرُهُنَّ ؟ قال لا إلا أنْ تطَوَّعَ وصيامُ شهرِ رمضانَ فقال: هل عليَّ غيره ؟ فقال: لا إلاّ أن تطوع وذكر له رسول الله صلى الله عليه وسلم الزكاة، فقال: هل علي غيرها ؟ قال لا إلاّ أن تطوع قال فأدْبَرَ الرجل وهو يقول: والله لا أزيدُ على هذا ولا أُنقِصُ منه، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: أفلَحَ إنْ صَدَقَ) هەر شەش زاناکانی حەدیس جگە لە ترمذي گێڕاویانەتەوە[1]. واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەرﷺ پرسی: ئیسلام چییە؟ ئەویش فەرمووی: ئیسلام بریتییە لە پێنج نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا. کابرا ووتی: غەیری ئەوە هیچی ترم لەسەر نییە؟ فەرمووی: نا، مەگەر خۆت لە زیادە هی تر بکەیت. ئیتر کابرا ڕۆیشت، بە دەم ڕۆیشتنەوە هەر دەیووت: نە لەوە زیاتر دەکەم نە لێشی کەم دەکەم. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەگەر ڕاست بکات سەرکەوتوو دەبێت، یان ئەگەر ڕاست بکات دەچێتە بەهەشتەوە، یان گەر ڕاست کات خۆی و باوکیشی سەرکەوتوو دەبن.

---

١ـ حەدیسەکە لە بوخاریدا لە / کتاب الایمانە ژمارە (٤٤) و لە موسلیمشدا بەم شێوەیە: عن أنس بن مالك قال: نهينا أن نسأل رسول الله صلى الله عليه وسلم عن شيء فكان يعجبنا أن يجيء الرجل من أهل البادية العاقل فيسأله ونحن نسمع فجاء رجل من أهل البادية فقال: يا محمد أتانا رسولك فزعم لنا أنك تزعم أن الله أرسلك قال: صدق، قال: فمن خلق السماء قال: الله، قال: فمن خلق الأرض قال الله قال: فمن نصب هذه الجبال وجعل فيها ما جعل ؟ قال: الله قال: فبالذي خلق السماء وخلق الأرض ونصب هذه الجبال الله أرسلك ؟ قال: نعم. قال: وزعم رسولك أن علينا خمس صلوات في يومنا وليلتنا. قال: صدق، قال: فبالذي أرسلك الله أمرك بهذا ؟ قال: نعم. قال: وزعم رسولك أن علينا زكاة في أموالنا. قال: صدق، قال: فبالذي أرسلك الله أمرك بهذا ؟ قال: نعم. قال: وزعم رسولك أن علينا صوم شهر رمضان في سنتنا. قال: صدق، قال: فبالذي أرسلك الله أمرك بهذ ا؟ قال: نعم. قال: وزعم رسولك أن علينا حج البيت من استطاع إليه سبيلاً. قال: صدق، قال: ثم ولّى. قال: والذي بعثك بالحق لا أزيد عليهن ولا أنقص منهن. فقال النبي صلى الله عليه وسلم: (لئن صدق ليدخلن الجنة) .

پێناسەی دووەم: مەعاویەی کوڕی حیدە دەڵێ: عەرزی پێغەمبەرمﷺ کرد (پێم ووت): تۆو ئەو خوای پەروەردگارە، ئەوە خوا تۆی بە چییەوە بۆ ئێمە ناردووە؟! فەرمووی: (بالاسلام)بە ئیسلامەوە. ووتی: نیشانەکانی ئیسلام چییە؟ فەرمووی:((أنْ تقولَ: أسلمْتُ وَجْهِيَ إلى اللهِ عزَّ وَجَلَّ وتَخَلَّيتُ، وتُقيمَ الصلاةَ وتؤتيَ الزكاةَ، كلُّ مسلِمٍ على مُسلمٍ مُحَرَّمٌ، أخوانِ نَصيرانِ، لا يَقْبَلُ اللهِ عزَّ وجَلَّ مِن مشركٍ بعدَما أسْلَمَ عَمَلاً، أو يُفارِقَ المشركينَ إلى المسلمينَ)) نەسائی گێڕاویتیەوە[١]. واتە: ئەوەیە کە بڵێی: ڕووم کردۆتە خواو خۆم تەسلیم بەو کردووە، ئینجا نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت، هەموو موسوڵمان لە موسوڵمانان حەرامە، چونکە دوو برای پشتیوانی یەکترین، هیچ کردەوەیەکی ئەو کەسە گیرا نابێت، کە دوای موسوڵمان بوونی کافر ببێتەوە، یان دوای ئەوەی کۆمەڵی کوفری بەجێ هێشت و هاتە ڕیزی موسوڵمانانەوە، بگەڕێتەوە بۆ سەر کوفر...

پێناسەی سێیەم: لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕنەوە، کە فەرموویەتی: ((الاسلام ان تشهد أن لا اله الا الله وأن محمدا عبده ورسوله وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت إن استطعت اليه سبيلا))[٢] واتە: ئیسلام ئەوەیە، کە بڕیار بدەیت هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت، تەنها خوای گەورە نەبێت، بڕیاریش بدەیت، کە محمدﷺ نێرراوی خوایەو نوێژ بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت، کە توانای حەجت بوو بیکەیت.

پێناسەی دوایین، سەرجەمی پێناسەکانی ترە، چونکە هەموو ئەوانی تر دەگرێتە خۆو پێناسەی هەموو ئیسلامی بە پێناسەی بەشێك کردووە، بۆ ئەوەی گرنگی ئەو بەشە بخاتە ڕوو، بەڵگەش بۆ ئەوە حەدیسێکی سەحیحی ترە، کە ئەم پێنجە بە ڕوکنەکانی ئیسلام دادەنێت. پێغەمبەرﷺ لە حەدیسێکدا، کە ئیبن

---

١ـ صحيح النسائي / الالباني ذمارة (٢٤٠٨).

٢ـ هەر پێنجیان ـ جگە لە بوخاری ـ گێڕاویانەتەوە.

عومەر دەگێڕێتەوە: ((إن الاسلام بني على شهادة ان لا اله الا الله وأن محمدا عبده ورسوله وإقام الصلاة وإيتاء الزكاة وحج البيت وصوم رمضان)) ئیمامی موسلیم و ترمزی[1] واتە: ئیسلام لەسەر پێنج شت دامەزراوە: بڕیار دان، کە هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای گەورەو بڕیار دان، کە محمدﷺ نێرراوی خوایە، نوێژ کردن، زەکات دان، حەج کردنی ماڵی خوا، ڕۆژوی ڕەمەزان.

ئەم حەدیسە وا باسی ئەوە دەکات، کە ئیسلام لەسەر ئەو پێنج ڕوکنە دامەزراوە، کەوا بوو ئەو پێنج ڕوکنە پایەن، کۆڵەکەی ئیسلامن، نەك هەموو ئیسلامەکە. گەرچی هەموو کاتێك کەرەستەی پێکهاتەی پایەکانیش هەر لەو کەرەستانەن، کە خانووەکەیان لێ دروست دەکرێت

کە یەکێك دەڵێ: فلان خانوو لەسەر چوار پایە دامەزراوە، ئەوە دەگەیێنێت کە چوار پایە هەن و خانوویەکیان لەسەر بنیات نراوە. ئەگەر یەکێك وا تێبگات، کە تەنها پایەکان هەن بەوانیش بە تەنها دەڵێن کۆشك و تەلاری تەواو، بە هەڵەدا دەچێت، ئیسلامیش هەر وایە... هەر کەس بەڵگەی دەوێ با قورئان بکاتەوەو سەرنجی بدات. ئەو کاتە دەبینێت، کە لە گەڵ باس کردنی ئەم پێنج پایەدا، باسی خوو ڕەوشت و کاروباری سیاسەت و بارو دۆخی کۆمەڵایەتی و ئاشتی و جەنگ و خێرخوازی و شەڕخوازیشی کردووە. یان هەر ئەوەندە بەسە بۆ دەرخستنی هەڵەی ئەو بۆچوونە، کە کتێبێکی شەرع(فیقه) بکاتەوە و سەیری سەرباسەکانی کات، ئەوسا دەبینێت لەگەڵ باسی ئەم پایانەدا باسی پەرستن و سەوداو مامەڵەو فەرمانڕەوایی وجیهاد و میرا ت و هاوسەرێتی و دەیان تەوەرە باسی تر دەبینێت، یان ئەوەندە بەسە هەڵەی ئەو بۆچوونە بخرێتە ڕوو، کە کتێبێکی وەکو سەحیحی

---

[1]- ڕیوایەتی تریشی هەیە وەکو: (بني الاسلام على خمس شهادة ان لا اله الا الله واقام الصلاة وحج البيت وصوم رمضان) رواه احمد وابو يعلى والطبراني في الكبير والصغير واسناد احمد صحيح.

بوخاری تەماشا بکات، کە نەك هەر باسی خواپەرستی تێدایە، بەڵکو سەدان حەدیسی لە باسی کڕین و فرۆشتن و بەڵێندان و سیاسەت و کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی لەخۆ گرتووە...

کەوا بوو ئەم پێنج ڕوکنە هەموو ئیسلامەتیەکە نین، بەڵکو پایەی ئیسلامن و کۆشکی ئیسلامەکەیان لەسەر وەستاوە...

کەوا بوو ئیسلام بناغەشەو خانووشە، بناغەکە ڕوکنەکانن، خانوەکەش ئەحکامە ئیسلامیەکانن.

کە دیراسەیەکی ئیسلام دەکەیت، دەبینی پڕۆگرامێکی سەربەخۆی سیاسەتی خۆی هەیە، کە لە ڕوانگەی سەربەخۆی خۆیەوە، تەماشای نیشتمان و دەسەڵات و سەروەری یاساو ڕێبازی کار و شوراو حوکم دەکات. دەزگای ڕاپەڕاندن و دابەشکردنێکی کارگێڕی سەربەخۆی خۆی هەیە.

کە دیراسەی ئیسلام دەکەیت دەبینی بەرنامەیەکی سەربەخۆی کۆمەڵایەتی خۆی هەیە، کە لە روانگەی ئەوەوە تەماشای مرۆڤ (ژن و پیاو) و خێزان و ژیانی کۆمەڵایەتی و تێگەیشتن لێیان دەکات .

کە دیراسەی ئیسلام دەکەیت دەبینی کۆمەڵێك ڕێسای سەربەخۆی تایبەتی خۆی بۆ ڕەوشت و ڕەفتار هەیە، کە لەسەر زەمینەی ئەوانەوە ڕێبازێکی واقیعی و ڕوون بۆ هەڵس و کەوتی موسوڵمانان دادەڕێژێت .

کە دیراسەی ئیسلام دەکەیت دەبینی پڕۆگرامێکی سەربەخۆی خۆی بۆ فێرخوازی هەیە، کە جیهانی پێ ئاوەدان دەکاتەوە... کە نەك هەر نکوڵی لە ڕۆژی دوایی ناکات، بەڵکو ناشهێڵێت فەرامۆش بکرێت، چونکە هەموو لایەنەکانی ئەم پڕۆگرامە تەواو داڕێژراوەو کەم و کورتی و لارو وێری تێدا نییە، نە زیاد ڕەوی

تێدایە نە شلگیری، هیچ شتێکی گرنگیش لە ژیاندا نابینیت، ئیسلام هەڵوێستی پەسەندی سروشتی بەرامبەر نەنواند بێت.

کە دیراسەی ئیسلام دەکەیت دەبینی پڕۆگرامێکی سەربازی سەربەخۆی خۆی هەیە، ئامانج و ئامادەسازی دیارەو ڕوونە، نەخشەی دامەزراوو چۆنیەتی هێنانە دی ئامانج و شێوازی مەشق و سیستمی گوێڕایەڵی و ملکەچی و پەیوەندی ئەندامە سەربازیەکان لە ناو خۆیان و بە خەڵکی و دەوڵەتیەوە هەمووی وا دارشتووە، کە شوێن کەوتوانی ئیسلام هەمیشە چاویان لە ئاسۆی بڵندی پێشکەوتن و فەراهەم هێنانی هێمنی و ئاسودەیی بێت بۆ کۆمەڵگەکەیان...

کە دیراسەی ئیسلام دەکەیت دەبینی سیستمی تایبەتی خۆی بۆ باری دارایی و ئابوری هەیە، چ لە بارەی ڕێکخستنیانەوە بێت، چ لەلایەنی چارەسەری کێشەکانی بە خاوەن بوون، یا مەسەلەکانی خەزێنەی دەوڵەت و پارسەنگ ڕاگرتنی هاتوو ڕۆیشتوو، یان ڕێسا گشتیەکانی مامەڵەی بازرگانی نێوان دەوڵەتی ئیسلامی و دەوڵەتانی تر...

بەم شێوەیە کێشەیەك نابینی لە کێشەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی کە ئیسلام حوکمێکی سەربەخۆی خۆی تێدا نەدابێت، کۆشکی ئیسلامیش ـ کە لەسەر پایەکانی دامەزراوە ـ بریتییە لە سەرجەمی ئەم حوکمانە...

دەبێت بەم شێوەیە لە حەدیسەکەی ئیبن عومەر ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ تێبگەین (حەدیسی: بنی الاسلام علی خمس...) دەبێت لەبەر ڕۆشنایی ئەم حەدیسەدا لە حەدیسەکانی تریش تێبگەین، ئەوەشە مەبەستی خوای پەروەردگار، کە فەرموویەتی: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَى لِلْمُسْلِمِينَ﴾ النحل/٨٩ واتە: قورئانێکمان بۆ ناردوویتەتە خوارەوە، کە

ڕون کردنـــەوەی هـــەموو شـــتێکی تێدایـــەو ڕێنمـــایی و بـــەزەیی و مژدەیـــە بـــۆ موسوڵمانان...

٨ ـ ئەمە ئەو ئیسلامەیە، کە خوا فەرمانی بە مرۆڤایەتی داوە شوێنی کەون و کاروبـاری دنیـاو ڕۆژی قیامـەتی خۆیـانی لەسـەر دامـەزرێنن، بـەڵام دەروونـی مرۆڤایەتی ـ بە پێی سروشتی خۆی ـ حەز بە ئەرك كێشان ناکـات، حـەز ناکـات سنوور بۆ حەزو ئارەزووەکانی دیاری بکرێـت، نایـەوێت هـیچ بەربەسـتێك ڕێ لـە هەوەس و نەوسی بگرێت! یا ئەو سـنوورو ڕێ یگـرتن و بەربەسـتانە لـە سـوودی خۆشی بن. بۆیە خـوای گـەورە ئـەوەی لەسـەر ئـەو کەسـانە فـەرز کـردووە، کـە هەقخوازن و باوەڕیان بە بەرنامەکەی خوای گەورە هێناوە، دەبێت ئەوان مرۆڤایەتی وا ڕابهێنن، کە ملکەچ و گوێڕایەڵی دەسەڵاتی خوا بن، ئەم ڕاهێنانەش بە فـەرمان کردن بە چاکەو بەرهەڵستی کردن لە خراپەو بە جیهاد کردن دەبێت.

فەرمان کردن بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپە، دەبێت کارێکی بـەردەوام بێـت، تەنانەت دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامیش، جیهادیش هەر وەهایـە، ئـەویش دەبێت هەر بەردەوام بێت، تا ئەو ساتەی شەریعەتەکەی خـوا لـە هـەموو جێیـەك دەچەسپێنرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَقَـٰتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِ﴾ البقرة/١٩٣ واتە: کوشتاریان لەگەڵدا بکەن تا ئەو کاتـەی فیتنـە نامێنێـت واتە: (خەڵك ناچار کردن لەسەر هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام) تا بەرنامەی هەموو ژیان هـەر شـەریعەتەکەی خـوا دەبێـت وبـەس... هـەروەها ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ قَـٰتِلُوا۟ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا۟ فِيكُمْ غِلْظَةً﴾ التوبة/١٢٣ واتە: ئـەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەو کافرانە پێشتر بکوژن، کە لێتانەوە نـزیکن، بـا توندو تیژیتان تێدا بەدی کەن.

ئەم سێ بنەمایە: (فەرمان بەچاکەو بەرهەڵستی لە خراپەو جیهاد) ئەو لایەنگرانەن، کە لە خودی خەڵکیدا هەن و بە سوودن بۆ بەرقەرار کردنی ئیسلام، هەرچەندە خوای گەورە خۆی داوای چەسپاندنی ئیسلامی کردووەو حەتمەن خۆشی لایەنگری ئەو کارەیە. بەڵام ئەم سێیە دەبنە زەمینە خۆشکەرو دەستپێکی پیادەکردنی ئیسلامەتی، هەرچەندە گرانیشن، بەڵام داواکاریەکی سروشتی مرۆڤ و مرۆڤایەتین. چونکە کاتێك ئیسلام کەنار دەخرێت، نا ئارامی باڵ دەکێشێت بەسەر هەموو مرۆڤەکاندا. غەزەب وسزای دنیاو قیامەتی خواییش لەولاوە بوەستێت، کە ئەنجامی لادان و ڕادانی ئایینەکەی لە دەسەڵات و حوکم بۆتە هۆی تووڕە کردنی خوای گەورە.

لەبەر گرنگی ئەم سێ بنەمایە دەبینیت، کە پێغەمبەرﷺ زۆرجار پێناسەی ئیسلامی بەمانە کردووە. بەززار لە پێغەمبەرەوەﷺ دەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: (( الإسلام ثمانية أسهم: الإسلام سهم، و الصلاة سهم، و الزكاة سهم، والصوم سهم، وحج البيت سهم، و الأمر بالمعروف سهم، و النهي عن المنكر سهم، والجهاد في سبيل الله سهم، و قد خاب من لا سهم له))[1] واتە: ئیسلام هەشت پشکە، هەشت بەشە: بەشێکی ئیسلامەتییە، بەشێکی نوێژە، بەشێکی زەکاتە، بەشێکی ڕۆژووە، بەشێکی حەجی ماڵی خوایە، بەشێکی تری فەرمان کردنە بە چاکەو بەشێکی تریشی بەرهەڵستی کردنە لە خراپە، جیهادیش بەشێکە، داماو ئەو کەسەیە کە بێ بەشە...

١ ـ سەنەدەکەی (حَسَنٌ لِغَيرِهِ)یە بڕوانە صحيح الترغيب والترهيب/ ئیمامی مونزیری/ توێژینەوەی شێخی ئەلبانی/٧٤١. هەندێك کە ووتوویانە ئەمە حەدیس نییەو فەرمایشتی حوزەیفەی کوڕی یەمانە، نەیان پێکاوە. (و).

الحاكم لە پێغەمبەرەوەﷺدەگێڕێتەوە، کە فەرمویەتی: ((الإسلام أن تعبد الله لاتشرك به شيئا وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت، والأمر بالمعروف، والنهي عن المنكر، وتسليمك على أهلك، فمن انتقص منهن شيئا فهو سهم من الإسلام يدعه، ومن تركهن كلهن فقد ولى الإسلام ظهره))[1] واتە: ئیسلام ئەوەیە، کە خوا بپەرستیت و هاوەڵی بۆ پەیدا نەکەیت، نوێژ بکەیت، زەکات بدەیت، ڕۆژوی ڕەمەزان بگریت وحەج بکەیت، فەرمان بکەیت بە چاکە، بەرهەڵستی بکەیت لە خراپە، سڵاو بکەیت لە ماڵ و منداڵی خۆت، هەر کەسێك شتێکی لەمانە کەم کردەوە ئەوە وازی لە بەشێکی ئیسلامەکە هێناوە، هەر کەسیش وازی لە هەمووی هێنا، ئەوە پشتی لە ئیسلامەکە کردووە ..

چاکە: وشەیەکی گشتییەو هەموو ئەو شتانە دەگرێتەوە، کە شەریعەتی ئیسلام داوای دەکات، یان ڕێی پێ دەدات، یان ناهێڵێت خەڵکی لێی نزیك ببنەوە، یان داوای کۆتایی پێهێنانی دەکات، وەکو حەرام یان (بوغزێنراو (مەکروە)... کەواتە چاکە بریتییە لە ئیسلام و ڕوکنەکانی، خراپەش بریتییە لە لە ئیسلام لادان لە حوکمی پایەکان و کەشکەکەشی، لەبەر ئەوەیە کە ئەرکی سەرەکی موسوڵمانان ئەوەیە، کە ئیسلامەکە سەرخەن، تا تەنها ئەو حوکمیان بکات، ناونیشانی حوکمی ئیسلامیش ئەوەیە، کە خوای گەورە دەربارەی فەرموویەتی: ﴿وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ ۝٤٠ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ﴾ الحج/ ٤٠-٤١ واتە: خوا ئەو کەسانە سەردەخات، کە وشە (ئایینەکە)ی

---

١- الحاكم لە ئەبو هورەیرەوە گێڕاوێتیەوەو دەربارەشی فەرموویەتی: (صحيح على شرط البخاري) واتە: سەحیحەو بە پێی مەرجەکانی بوخارییە.

خوا سەردەخەن، خوا خاوەن هێزەو بێ وێنەیەو بەسەر هەموو شتێکدا زاڵە. ئەو کەسانەی کە ئەگەر خوا لەسەر زەمین جێگیریان کات (بە گرتنە دەستی دەسەڵات و حوکم) پارێزگاری ئیسلامەتی دەکەن و هێزو دەسەڵاتی ی شەڕخوازی ناهێڵن و دەست درێژی ناکەن و نوێژ دەکەن (بۆ یاد کردنی بەردەوامی خوای گەورە و ڕاپەڕاندنی شەریعەتەکەی)و زەکات دەدەن (تا خۆیان لە ڕەزیلی و کۆمەڵگەکەیان لە هەژاری بپارێزن)و، فەر [illegible] ـە چاکە دەکەن و بەرهەڵستی لە خراپە دەکەن و (ئاڵای خێرخوازی لە جیهاندا بە [illegible] ـەکەنەوە) کۆتایی هەموو کاروبارێکیش هەر بۆ خوا دەگەڕێتەوە

نوێژ کردن: نیشانەی ئەوەیە، کە دەوڵەتەکەیان دەوڵەتێکی خوا ویستییە.

زەکات دان: نیشانەی ئەوەیە، کە دەوڵەتەکەیان دەوڵەتێکی دادی خواییە.

فەرمان بە چاکە کردن: نیشانەی ئەوەیە هەموو چاکەیەك لە وڵاتەکەیاندا لە برەودایە.

بەرهەڵستی لە خراپە کردن: نیشانەی ئەوەیە، کە هەموو خراپەیەك لە دەوڵەتەکەیاندا لە نوشوستیدایە.

ئەمانەش هەموو نیشانەی ئەوەن، کە ئیسلام لەسەر بناغەو کۆشکی خۆی دامەزراوە ..

لەبەر ڕۆشنایی ئەمەدا کە باسمان کرد، دوو پێناسەکەی دوایین، کە لەسەرەوە هێنامانەوە ئەوەی بەرزراو الحاکم، پێناسەی ئیسلام دەکەن بەو بەشە گرنگانەیەوە، کە تێیدا هەن، ئەگەر چی دیسان هەردووکیشیان پێناسەی هەموو ئیسلامەکەیان هەر نەکردووە، چونکە ئیسلام ـ وەکو زانیمان ـ لەوە زیاترە لەوەی، کە ئەو دوو پێناسەیە هەمووی باس کەن، چ جای یەکێکییان بە تەنها...

چونکە پێناسەی یەکەم لەگەڵ باس کردنی ڕوکنەکاندا، باسی سێ بنەماکەی کرد،کە لایەنگری بەرقەرار کردن و پیادەکردنی ئیسلامن، ئیسلام لەوەش زیاترە، هەروەها لەوەش زیاترە، کە پێناسەی دووەم تێکهەڵکێش لەگەڵ یەکێك لە ڕەوشتەکانی موسوڵمان باسی کردووە، کە دەبێت لەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆیدا چۆن بێت! کە بێ گومان ئەمیش لەبەر گرنگی ئەو سیفەتە ڕەوشتییەیە.

ئەم دوو پێناسەیە ـ وەکو بینیمان ـ بریتی نەبوون لە هەموو ئیسلام.

حەدیسەکەی عومەری کوڕی خەتتابیش (ﷺ) هەر لەم ڕوانگەوەیە، کە دەیگێڕێتەوە: ((بينما نحن عند رَسُول اللّهِ صلى الله عليه وسلمذات يوم إذ طلع علينا رجل شديد بياض الثياب شديد سواد الشعر لا يرى عليه أثر السفر ولا يعرفه منا أحد حتى جلس إِلَى النبي صلى الله عليه وسلم، فأسند ركبتيه إِلَى ركبتيه ووضع كفيه عَلَى فخذيه وقَالَ: يا محمد أخبرني عَنِ الإسلام؟ فقَالَ رَسُول اللّهِ صلى الله عليه وسلم: الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا اللّه وأن محمدا رَسُول اللّهِ، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا قَالَ صدقت. فعجبنا له يسأله ويصدقه! قَالَ: فأخبرني عَنِ الإيمان ؟ قَالَ: أن تؤمن باللّه وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر؛ وتؤمن بالقدر خيره وشره قَالَ صدقت. قَالَ: فأخبرني عَنِ الإحسان؟ قَالَ: أن تعبد اللّه كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك. قَالَ: فأخبرني عَنْ الساعة؟ قَالَ: ما المسئول عَنْها بأعلم مِنَ السائل. قَالَ: فأخبرني عَنْ أماراتها؟ قَالَ: أن تلد الأمة ربتها، وأن ترى الحفاة العراة العالة رعاة الشاة يتطاولون في البنيان! ثم انطلق فلبثت مليا ثم قَالَ: يا عمر أتدري مَنِ السائل؟ قلت: اللّه ورسوله أعلم. قَالَ: فإنه جبريل أتاكم يعلمكم دينكم)) متفق عليه. واتە: کە لە خزمەت پێغەمبەرداﷺ دانیشتبووین، لە پڕ پیاوێك هات پۆشاکەکەی بەری زۆر سپی بوو، مووی سەری زۆر ڕەش بوو، هیچ ئاسەوارێکی سەفەری

پێوە دیار نـەبوو (وەك تـۆزو خـۆڵ و مانـدوویی و تینـوێتی) کەسیـشمان نـەمان دەناسی، چووە خزمـەت پێغەمبـەرﷺهـەردوو ئـەژنۆی نـا بـە هـەردوو ئـەژنۆی پێغەمبەرەوە وﷺ، هەردوو لەپی دەستی خستە سەر هەردووك ڕانی پێغەمبەرﷺ، ئینجا پرسی: ئەی محمد، ئیسلامم بۆ باس کە، فەرمووی: ئیـسلام ئەوەیـە بڕیـار بدەیت کە هیچ شتێك نییە شایانی پەرستن بێت بێجگـە لـە خـوای گـەورە، بڕیـار بدەیت، کە محمدﷺ بەندەو نێرراوی خوایە، نوێژ بکەیت و زەکات بـدەیت و ڕۆژوی ڕەمەزان بگریت، ئەگەر توانات هەبوو حەجی مـاڵی خـوا بکـەیت، کـابرا ووتـی: ڕاستت کرد، پێمان سەیر بوو، کە لێشی دەپرسێت و دەشڵێت ڕاستت کرد! ئینجـا ووتی: ئەدی بـاوەڕ هێنـان چـۆنە؟ فـەرمووی: ئەوەیـە کـە: بـاوەڕ بـە خـواو بـە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە نێرراوەکـانی و بـە ڕۆژی دوایـی وهـەروەها بـە خێروشەڕی قەدەر بهێنێت. کابرا ووتیەوە: ڕاستت کرد! ئینجا ووتی: ئەدی چـاکە چییە؟ فەرمووی چاکە ئەوەیـە، کـە وا خـوا بپەرسـتیت، کـە هـەر وەکـو ئـەوەی بیبینیت، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت، ئەو تۆ دەبینێت. ئینجا ووتی: ئەدی کەی ئاخر زەمانە؟ فـەرمووی: ئـەو کەسـەی لێـی دەپرسـن زانـاتر نییـە لـەو کەسـەی دەپرسێت. پرسی باشە نیشانەکانی چییە ؟ فەرمووی: ئەوەیە کە جاریەو کـەنیزەك ئاغای خۆیان لێ ببێت و پێ پەتی ورەش و ڕوت و شوانی مەڕ، کۆشـك وتـەلاریان زۆر بەرز کەنەوەو شانازییان پێوە بکەن!

پاشان کە کابرا ڕۆیشت من هەر لە جێی خۆم چەقیم! پێغەمبـەرﷺ فـەرموی: عومەر(ﷺ)، دەزانی ئـەوە کـێ بـوو دەیپرسـی؟ ووتم: خـواو پێغەمبـەری خـوا دەزانن، فەرمووی: ئەوە جوبرەئیل بوو، هاتبوو، ئایینەکەتان فێر کات...

هەندێك کەس لە ڕستەی (هاتبوو ئایینەکەتان فێر کـات) وا تـێ دەگـەن، کـە ئایینی ئیسلام هەمووی ئەو سـێ باسـەیە! بێگومـان ئەمـە هەڵـە تێگەیـشتنە،

چونکە ڕێسای ئاسایی تێگەیشتن ئەوەیە، کە هەموو نەزانراوێك(نکرة) لە ڕستەی نەرێ(نفی)دا دەبێتەوە بە باسێکی گشتی. بەڵام هیچ زانراوێك (معرفە) لە ڕستەی (مثبت)دا نابێت بە باسی گشتی... کەوا بوو حەدیسەکەی پێغەمبەرﷺ ئەوەی، کە (ئاینەکەتان فێر کات) مانای ئەوە نییە، کە کۆو بەشەکانی هەموو ئایینەکەتان فێر دەکات! بەڵکو هەندێکلە ئایینەکەتانتان فێر دەکات.

ئەگەر کەسێك کتێبێکی شەرع (فقهی ئیسلامی) بخوێنێتەوە، ئێمە لێی بپرسین: ئەرێ چی دەخوێنێتەوە؟ بڵێت: ئیسلام، وەڵامەکەی ڕاستە، بەڵام خۆ ئاشکرایە، کە ئیسلام لە کتێبێکی شەرعناسی فراوانترە. یان ئەگەر کەسێك بابەتێکی شەرع بخوێنێت، لێی بپرسین: ئەرێ چی دەخوێنیتەوە؟ بڵێت: شەرع، وەڵامەکەی ڕاستە، بەڵام خۆ ئەو، هەموو شەرعەکە ناخوێنێت. یان ناخوێنتەوە. ئاماژەی حەدیسەکەش هەر بەو جۆرەیە...

ئەگەر بە وردی تەماشای حەدیسەکە بکەینەوە دەبینین: چاکە کردن بریتییە لە باوەڕ هێنان، باوەڕ هێنانیش بالآترین پلەیە، وەکو پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((أفضلُ الایمانِ أنْ تَعْلَمَ أنَّ اللهَ شاهِدُكَ حيثُمَا كُنْتَ))[1] واتە: باشترین باوەڕ ئەوەیە، کە بزانیت لە هەر کوێ بێت خوا دەتبینێت ..

شەش ڕوکنەکەی باوەڕیش دەکەونە نێو چوارچێوەی شایەتمانەوە، وەکو لەمەودوا ـ إن شاء الله ـ ڕونی دەکەینەوە. کەوا بوو حەدیسەکە هەر ڕوکنی یەکەمی ڕونکردەوە (کە یەکێکە لە ڕوکنەکانی ئیسلام) بەڵام بە شێوەیەکی بەرفراوانتر...

---

١ـ نوسەر خۆی ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ دەربارەی سەنەدەکەی نوسیویێتی: (ضعيف ولكن معناه صحيح. راجع الطبراني في حلية الاولياء). منیش چەندم کرد سەنەدی ئەو ڕیوایەتەم نەدۆزیەوە بەڵام لە حەدیسێکی تری (حەسەن)دا دەفەرموێ: ((أفضل الإيمان أن تعلم أن الله معك حيثما كنت))حديث حسن (و) .

ڕوکنەکانی ئیسلامیش ـ وەکو بینیمان ـ بەشێکن لە ئیسلام، نەك هەموو ئیسلامەکە، کەوا بوو لەوەی سەرەوە دەگەینە ئەوەی کە :

١ـ ئیسلام عەقیدەیەکە لە شایەتمان و ڕوکنەکانی باوەڕ هێناندا دەردەکەوێت .

٢ـ ئیسلام خواپەرستنە، ئەمیش لە نوێژو زەکات و ڕۆژوو حەجدا دەردەکەوێت.

ئەم دوو خاڵەش ئیسلامن ..

٣ـ ئیسلام خانوویەکەو لەسەر ئەم ڕوکنانە دروست بووە، ئەمەش لەو پرۆگرامە ئیسلامیانەدا دەردەکەوێت، کە بۆ ژیان داڕێژراون، وەك پرۆگرامی سیاسی و ئابوری و سەربازی و ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و فێرخوازی و... هتد.

٤ـ ئیسلام چەند بنەمایەکی لایەنگری هەیە، کە بۆی دەبنە ڕێبازی دامەزراندن وەك فەرمان بە چاکەو بەرهەڵستی لە خراپەو جیهاد کردن. ئەمانە غەیری لایەنگرە خواییەکانن، کە بریتین لە سزای سروشتی و سزای دنیایی و قیامەتی خوایی، کە لە دنیادا جاری وا هەیە لە قەهرو غەزەبیدا دەردەکەوێت، لە ڕۆژی دواییشدا لە بەهەشت و دۆزەخەکەیدا...

کەوا بوو ئیسلام بریتییە لە:

* بنەما لایەنگرەکان: فەرمان بەچاکەو بەرهەڵستی لە خراپەو جیهادو حوکم و سزا خواییەکان

* بیناکە: سیستەم و بەرنامەکانی ژیان (بەرنامەی سیاسی، بەرنامەی ئابوری، بەرنامەی سەربازی، بەرنامەی فێرخوازی، بەرنامەی ڕەفتارو ڕەوشت، بەرنامەی کۆمەڵایەتی).

* ڕوكنەكان: نوێژ، زەكات، ڕۆژوو، حەج، شایەتمان (ئەمیش بریتیە لە باوەڕ هێنان بە خواو بە فریشتەكان و بە پەیامە ئاسمانییەكان وپێغەمبەران و ڕۆژی دوایی و قەدەر.

٩ـ هەرچی لە ئیسلام ترازا جاهیلییەتە، چونكە بەرامبەر هەر بەشێكی ئیسلامەتی جاهیلییەتێك هەیە، نابینیت پێغەمبەرﷺ كە ئەبو زەڕی غەففاری بینی تانەی ڕەش پێشستی لە كابرایەكی تری موسوڵمان دەدات، پێی فەرموو: (انَّكَ امْرُؤٌ فيكَ جاهِليةٌ) بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە، واتە: تۆ كابرایەكیت هێشتا جاهیلییەتت تێدا ماوە! یان ئەو ئایەتەی، كە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ﴾ الاحزاب /٣٣ واتە: خۆتان بە دەستوری جاهیلییەتی پێشوو ڕووت مەكەنەوە. كەوا بوو خۆداپۆشینی ئافرەت ئیسلامەتییەو ڕوت و سفوریشی جاهیلییەتە. عومەری كوڕی خەتتابیش(ﷺ) دەفەرموێ: ((انَّما تَنقُضُ عُرى الإسلام عُروةً عروةً اذا نشأ في الإسلام من لم يعرف الجاهلية)) ئیمامی ئەحمەد. پایە بە پایەی ئەم ئیسلامە بەوە تێك دەچێت، كە كەسانی وا بێنە پێش، كە جاهیلییەتیان نەناسیبێت .

ئیسلام بە هەموو لقەكانیەوە بەرامبەر جاهیلیەت دەوەستێتەوە، چونكە هەموو بەشێكی ئیسلام زانستییەو خواییەو هەموو شتێكی گرتۆتەوە، هەرچی فیكرو ڕەوشت و ڕەفتارێك لەگەڵ ئیسلامدا یەكانگیر نەبێتەوە و بەرامبەری بوەستێتەوە جاهیلییەتە، چونكە لە زانینێكی كەمەوە هاتووە، زانینی سنورداری مرۆڤ خۆی! قابیلیش نییە هەر حەزو هەواو هەوەس و نەوس و نەفسی خۆی تێكەڵ بووە، بۆیە زۆرجار هەر ناپەسەندییەو بە پەسەند دەناسرێنرێت، یان چەوتەو بە دروست دەدرێتە قەڵەم!!

ئیسلام بەرنامەیەکی تەواوی گشتگیری بێ لەکەیە، جاهیلییەتیش کەم و کورتەو ناتەواوە، مرۆڤیش سەرپشکە (موخەییرە) لە وەرگرتنی ئیسلام یان جاهیلییەت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا﴾ الانسان/٣ واتە: ئێمە هەردوو ڕێگاکەمان نیشانی مرۆڤ داوە، ئەویش سەربەستە دەتوانێت ڕێی شوکرانە بژێری هەڵبژێریت یان کوفرانە بژێری، کەیفی خۆیەتی.

زۆر جار هەندێك کەس ڕێبازی ڕاستییان لێ بزر دەبێت، یان گومان لە ڕاستیەکە دەکەن، بە تایبەتی، کە دەبینن وا خەڵکانێك لەسەر ڕێبازی جاهیلییەتیشن و خووڕەوشتیشیان بەرزە! یان هەقخوازن و لە زۆر هەڵس و کەوتیاندا پارسەنگن! ناوو سەرکەوتنیش لە دنیادا وەدەست دەهێنن! بەڵام هۆی ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ ئەو دیدە جاهیلییەی هەیانە، بەڵکو بۆ ئەو لایەنە ئیسلامییەی کەوتۆتە ناو جاهیلییەتە، کە یانەوە، ئەو لایەنانە لای هەر کەس و لە هەر کوێیەك دەرکەون هەر جوانن، خۆ خەڵکیش کە دەکەوێتە شوێن جاهیلییەت حەتمەن هەندێك لایەنی جوانی تێدا بەدی دەکات. بەڵام هەر ئەو کەسانە، گەر لە ئیسلام شارەزا بن، دەبینن ئیسلام هەر هەموو جوانی ئەو بەرانەی جاهیلییەتی لە خۆ گرتووە بێ ئەوەی هەڵەو پەڵەی ئەوانی کەوتبێتە سەر، چونکە ئیسلامەتی سەرجەمی چاکەو خێرخوازی و ڕەوشت بەرزییە...

هەبوونی ئەو چەند جوانییە ئیسلامییە لە جاهیلییەتێکدا، شتێکی سروشتییە، لەوانەیە ئەنجامێکی کارتێکردنی ئەو ژیرییە بێت، کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیووە، یان سەرەنجامی ئەو ڕەفتارە ڕۆحییە پاکە بێت، کە خوای گەورە کردیە سروشتێکی جوانی مرۆڤ! ئەوەی کە دەرهەقی فەرموویەتی: ﴿رَبُّكَ هُوَ أَعْلَمُ مَن﴾الحجر/٢٩ واتە: من لە ڕۆحی خۆم فوم پێدا کردووە... ئەو ڕۆحە تایبەتیەیە،

کە خوای گەورە دروستی کردوو کردی بەبەر ئادەمدا، ئینجا بۆ ڕێز لێنانی دەفەرموێ: ڕۆحی خۆم... ئیتر لەمەوە ـ ئەو کەسانەی سروشت و ڕۆحیان پاك ماوە ـ شتی چاك وخراپ باشتر لێك جیا دەکەنەوە، وردتر دەتوانن ئەو شتانە هەڵاوێرن، کە بۆ شارستانێتی و خزمەتی مرۆڤایەتی سوود بەخشە. بەلأم مرۆڤ پەی بە هەموو شتێکی شاراوە نابات، هەر نوقسانەو لە زۆر لایەنی ناسینی ژیان و گەردوون و جیهانی خودی مرۆڤ شارەزا نابێت، ئەمە جگە لە پێناسەی حەق و ڕاستی، جگە لە دەیان نەخۆشی و لاسەنگی دەرونی و هەوەسبازی و ئارەزوو مەندی ئەم و ئەو، کێ هەیە لەم هەموو بەربەست وکەندەڵانە ـ دوور لە وەحی خواییەوە ـ دەرچێت...

بۆ دڵنیا بون، جارێکی تریش ئەوەی وتمان دووبارەی دەکەینەوە: کە بەلێ ئێمەش دەڵێین: ژیری زۆر شتی چاك و ڕێك پێك دەبینێت، بەلأم ئەمە ئەوە ناگەیێنیت، کە بڕوامان وا بێت ئەوەی ژیری دەرکی پێ دەکات، هەر ئەو ڕاستەو گومانی تێدا نییە. نا، ڕاستە ژیری لە سنوری دیاری کراوی خۆیدا زۆرجار هەق بە هەق دەبینێت، یان شتێك وەکو هەقیقەتی خۆی دەبینێت، یان زۆر شت بە چاك و ڕاست وداد پێناسە دەکات، بەلأم حەتمەن دەبێت وەحی خوایی بڕیاری لەسەر بدات، وەحی خوایی دەبێت شایەتی لەسەر ڕاستی دید و پێناسەکانی ژیری بدات، چونکە ئەوەی، کە حەقیقەتی هەموو شتێك دەزانێت و پەی بە هەر هەموو شتێك دەبات خوای پەوەردگارو زانایە، خوا لە ڕۆحی خۆی فوی بەم مرۆڤەدا کردووە، خوا ئەمی فێر کردووە، بەلأم ئەو زانینەی بەم مرۆڤە داوە بە قەدەر تواناو قابیلییەتی خۆیەتی، نەك ئەوەندە زۆر بێت بۆ دارشتنی دید و ڕێبازی کارو بەڕێوەبردنی هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی هەر بەکار بێت... ئەوەیان ماف و ئەرکی خوای گەورەیە، چونکە ئەو کردگارو کارزان و کارجوانە ئەو هەرگیز هەڵە ناکات.

مەبەستمان لەم قسانە ئەو شتانە نییە، کە دێنە ژێر تاقی کردنەوەوە و لە ڕێی سەلماندنەوە ماهییەتیان ڕون دەبێتەوە، چونکە ئەمەیان ئیسلام بڕیاری لەسەر داوەو موسوڵمانانیشی بۆ هانداوە، بەڵکو مەبەستمان لە ڕێساکانی پەروەردەو ئاراستە کردنی داڕشتنی ڕەوشت و ڕەفتاری مرۆڤە، کە دەبێت بە شێوەیەك بێت لەگەڵ یاساو ڕێسا گەردوونیەکاندا یەك بگرێتەوە...

خوێندنی یەك پێکهاتەی لەشی مرۆڤ، پێویستی بە تێکۆشانی زانایەك، یان چەندین زانای پسپۆڕو شارەزا بۆ ماوەیەکی زۆر هەیە، تەنانەت جاری وا هەیە دیراسەی سێلێك، یان بچوکتر پێویستی بە ڕەنجی چەندین زاناو پسپۆڕ و ماوەی تەواو هەیە، دەرونی مرۆڤ و هەست و سۆزی، یان پەیوەندی بەستن و پارسەنگ ڕوانین و... هتد، هەمووی هەر پێویستی بە ڕەنجی پسپۆڕان و شارەزایان و کاتی تەواو هەیە، تا ئەنجامێکی ڕاست وەدەست بێت.

هۆکانی تۆوی توخم و بۆماوەیی(وراثة)، کە لە باوکەوە بۆ منداڵ و نەوەکانی دەگوێزرێنەوە، هۆ زەمینییەکان، ئاوو هەوا، کۆمەڵگاو گۆڕانکاریەکانی ناوی، باری کۆمەڵایەتی بەو هەموو لایەنە تێکچڕژاوو ئاڵۆزەیەوە کە هەیەتی!

هەر کەسێك لقە باسێك لەمانەی سەرەوە بخوێنێت و زۆر زۆر شارەزا تێیاندا ببێت، هەردەتوانێت پەی بە نهێنیەکانی ئەو باسە ببات، کە خۆی تێیدا تایبەتمەند بووە، ئەمما بێت و بیەوێت بەرنامەی هەموو لایەنەکانی ژیانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بۆ خەڵکی داڕێژێت، حەتمەن بە نوقسانی دایدەڕێژێت. شتێکی ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت پەی بە هەموو لایەنی مرۆڤ و مرۆڤایەتی ببات و هەموو شتێك لە هەموو شتێك بزانێت!

گریمان کۆمەڵێك زانا هەر یەکەیان بەشێکیان لە ژیانی مرۆڤ وەرگرت و کەوتنە توێژینەوەی، سەرەنجام دەبینیت هەر یەکەیان شارەزای بەشێکەو لە زانیاریەکی لای

ئەوانی تر بێ بەشە، بۆیە هەر حوکمێك بۆ هەموو ژیان دابنێت هەر نوقسان دەبێت، ئەگەر هەر یەکەشیان لای خۆیەوە بە پێی تایبەتمەندیەکەی خۆی دیدو تێڕوانینی خۆی کردە بەرنامەو پێوەر، حەتمەن هی هەر هەموویان بە یەکتر دەکێشرێن و ئەو خالانەی، کە هاوبەشی نێوان هەموویان نین کێشە دروست دەکەن. بۆیە خوای گەورە دیاری کردنی بەرنامەی ژیانی مرۆڤی نەداوەتە دەست کەس، چونکە هەر ئەو دەزانێت و هەر ئەویش دەتوانێت و هەر ئەویش ئەو مافەی هەیە، چونکە هەر ئەو هەموانی دروست کردووە، واشی کردووە، فەرموشیەتی، هەر کەس شوێن بەرنامەکەی من نەکەوێت، هەرچییەکی تر بگرێتە بەر لێی قبوڵ ناکرێت و لە دنیاو ئاخیرەتیشدا زەرەرمەند دەبێت.

دوای ئەمە دەڵێین:

کەوا بوو لە عەقیدەدا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە، لە پەرستندا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە، لە فێر بوون و فێرکردندا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە. لە خوورەوشتدا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە، لە سیاسەتدا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە، لە شەڕو ئاشتیدا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە...

لە هەموو بڕگە سیاییەکدا ئیسلام و جاهیلییەت هەیە...

لە هەر چیەك هەقخوازی هەبوو، ئەوە ئیسلام لەوێیە، بەرژەوەندی مرۆڤ لە کوێ بێت، ئیسلامیش لەوێیە، ئەو جێیەی بەرژەوەندی مرۆڤی لێ نییە جاهیلییەتە، بەرژەوەندی ڕاستی مرۆڤیش بە شەریعەتەکەی خوا دەپێورێت...

جاهیلییەتی عەقیدە و پەرستن و ڕێباز، پیسترین و دژوارترین جاهیلییەتن، بۆیە ئەگەر کەسێك چەند ڕەفتارێکی جاهیلییانە بکات، بەڵام عەقیدەکەی ڕاست مابێت، خوای گەورە لێی دەبورێت، بەڵام ئەو کەسەی کە هەڵەو پەڵە لە عەقیدەو پەرستن و ڕێبازەکەیدایە، خوای گەورە لێی نابورێت، با ڕەوشت و ڕەفتاریشی

ئیسلامیانە بێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ﴾ النساء/٤٨ واتە: خوا لە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دان خۆش نابێت، ئەمما گوناحەکانی تر، ئەوە خوای گەورەر بۆ هەر کەسێکی حەز بکات لێی دەبورێت...

خوای پەروەردگار ئەم ئیسلامەی بە تەواو کاملی ناردووە، هەر کەس وەری بگرێت ئەوە موسوڵمانە، هەر کەسێکیش بەشێکی وەرگرت و وازی لە لایەنەکانی تری هێنا، ئەوە ئیسلام و جاهیلییەتی تێکەڵ یەك کردووە: ﴿ وَءَاخَرُونَ ٱعۡتَرَفُواْ بِذُنُوبِهِمۡ خَلَطُواْ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَءَاخَرَ سَيِّئًا ﴾ التوبة/ ١٠٢ واتە: هەندێکی تریان دانیان بە تاوانی خۆیاندا نا، کە کردەوەی چاکیان تێکەڵ بە کردەوەی خراپ کردووە...

ئەو کەسەی باوەڕی بە ئیسلام هەیە ئەوە موسوڵمانە، مادام کە تاوان دەکات زوو پەشیمان دەبێتەوەو تۆبە دەکات، چونکە دەزانێت حەقخوازی چییە، ئەمما ئەو کەسەی باوەڕی هەیە، بەڵام سوورە لەسەر گوناح و تاوانکاری، ئەوە فاسقە، چونکە دەبێ موسوڵمان خۆ لە قەرەی گوناح نەدا، گەر بەریشی کەوت زوو پەشیمان بێتەوەو تۆبە بکات، نەك هەر بەردەوام بێت، تا گوناحکاری دەکاتە پیشە! موسوڵمان وەك چۆن وازی لە هەموو بیروباوەڕێکی جاهیلیی هێناوە، پێویستە واز لە هەموو ڕواڵەت و جەوهەرو سیفەت و ڕەفتارێکی جاهیلیی بهێنێت. ئینجا پێویستە لەسەر هەموو موسوڵمانانیش ـ وەکو کۆمەڵێکی ئایین پەروەر ـ ڕواڵەتی تەواوی موسوڵمانانەیان پێوە دیار بێت و ملکەچی ئەو سیستم و دەسەڵاتە شەرعیەی خۆیان بن، کە بە ڕەنجی هەموویان هاتۆتە دی، لە هەمان کاتیشدا هەوڵی نەهێشتنی جاهیلییەتیش بدەن، بەڵام ئەو لادانە دژوارەی لە سیستمی حوکمی ئیسلامی دەرکەوت، هەر زوو ئیسلامی لە حوکم و خیلافەتی سەر ڕێبازی

پێغەمبەرەوەﷺ گۆڕی بۆ پاشایەتی و دەسەڵاتی سەپاو! هەر وا هاتەوە، کە پێغەمبەرﷺ پێشتر هەواڵی دابوو! کە فەرموو بووی: ((الخلافة بعدي ثلاثون ثم تكون مُلْكاً عَضُوضاً))[1] واتە: ماوەی خیلافەت لە خوای مـن سی ساڵە، ئینجا دەبێتە پاشایەتی ویراسی پشتاوپشتە! لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرموێ: ((الخلافة بعدي في أمتي ثلاثون سنة ثم مُلْكٌ بعد ذلك)) رواه احمد والترمذي وابو يعلى وابن حبان عن سفينه وهو صحيح. هەموو ئەم حەدیسانە ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە جاهیلییەت لە دەروازەی حوکمەوە دەخزێتەوە ناو ئیسلامەوە! ((تَنقُضُ عُرَى الاسلام عُرْوَةً عُرْوَةً اوَّلُهَا الحُكْمُ واخِرُهَا الصلاةُ)) أخرجه أحمد واتە: ئیسلام بە رمانی پایە بە پایەی دەڕوخێت لەسەرەتایەوە حوکم و دوایییەکەشی نوێژەکان! مەگەر ئەم واقیعەی ئێستا بەڵگەی سەلماندنی ئەو هەواڵە نییە ؟!

لە جیاتی ئەوەی ئیسلام هێرش بباتە سەر جاهیلییەت و ڕیشەکێشی کات، جاهیلییەت وای لێ هاتووە هەوڵ بدات ئەم لە ڕیشەوە هەڵکێشێت... ئەمڕۆ بوومی جاهیلییەت دەخوێنێ و موسوڵمانان بەدەنگیەوە دەچن!! ئەوە کۆمۆنیزم، تەبشیری خاچپەرستان، فەلسەفەی لیبراڵی و بەرەڵایی، گروپی سیاسی دوور لە ئاڕاستەی ئیسلام و نۆکەرانی بێگانە، کرێگرتەیی کوفر بە ناوی پێشکەوتن و پێشکەوتنخوازییەوە! دژایەتی ئیسلامیش بە ناوی دژایەتی کۆنەپەرستییەوەو سەدان بانگەشەی ترو هەزاران دروشمی تر... ئەمانەش وەنەبێت لە پڕێکا هاتبنە ئاراوە، نا... ئەمە کۆنەو بە بانگەوازێکی هێدی و پشوو درێژو بە دەیان شێوازی جۆراو جۆر خزاونەتە مەیدان، هەر یەکێك لەم بانگەوازە جاهیلییانە، توانی بنکە

---

[1]ـ نوسەر سەنەدی ئەم حەدیسەیانی نەنوسیووە، بەڵام ئەو ڕیوایەتەی دووەمی سەحیحەو ئەمەش ڕیوایەتێکی تری، کە دەفەرموێ: (الخلافة بعدي ثلاثون سنة). رواه أحمد وأبو داود والترمذي(٢٤٦). قال الألباني: وإسناده حسن.(و)

لە جیهانی موسوڵماناندا بۆ خۆی سازکات و گەرای بیروباوەڕی خۆ ی بڵاو کاتەوە... گەورەترین یارمەتیدەریشیان:

١ـ نەزانی و تێنەگەیشتنی موسوڵمانان لە ئایینەکەیان بوو.

٢ـ گواستنەوەی دەسەڵاتی سیاسی بوو، سەرەتا بۆ داگیر کەرە ئیمپریالیستەکان و، دواتر بۆ ئەو بەکرێگیراوانەی فیکرو دید و سیات و ڕێبازیان لە داگیر کەرانەوە وەرگرتبوو... ئیتر لە هەموو لایەکی وڵاتی موسوڵمانانەوە شەڕی سەخت بەرپا کرا، داگیر کەران بە هەموو توانای خۆیانەوە پشتی بەکرێ گیراوانیان گرت و کردیانن بە شت، موسوڵمانانیش بە دینەکەیانەوە لە پاشەکشەی ژیان و مردندا بوون. تا ئەو ئیسلامە مەزنە ئاوا لە وڵاتی خۆیدا بە نامۆیی مایەوە!!

لە تین و تەوژمی ئەم هۆکارانەوە بوو، کە ناچار بووم ئەم کتێبە بەو شێوە بەرفراوانە بنووسم، بە چاکیشم زانی بابەتەکە بکەمە چوار باس:[1]

١ـ ڕوکنەکانی ئیسلام. ٢ـ بەرنامەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت. ٣ـ پرۆگرامە گشتیەکان .

٤ـ پاڵپشتەکانی ئیسلام.

دەمانەوێت بەم شێوەیە لە ئیسلام بکۆڵینەوە، تا بە تەواوی ئیسلامەکە بخەینە ڕوو، تا خوێنەران لە ئیسلامەکە تێ بگەن، کە هاوەڵ قبووڵ ناکات و ئەو کەسەش بە موسوڵمان ناناسێت کە بۆی بڕیار دەدات. دیسان تا ئەوە ڕوون بێتەوە، کە موسوڵمان کێیەو دیدو ڕێبازو ڕەوشتی موسوڵمانانە کامەیە ؟! تا هەموو

---

١ ـ ئێمە کردوومانەتە شەش بەرگ کتێب :

١ـ شایەتمان ٢ـ چوار ڕوکنەکەی تر. ٣ـ بەرنامەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشت. ٤ـ دەوڵەتی ئیسلامی و سیاسەتی ئابوری. ٥ـ سیاسەتی سەربازی و سزایی. ٦ـ پاڵپشتەکانی ئیسلام.

کەسێکیش ڕۆڵی خۆی و بەرپرسێتی خۆی چاو لێ بێت و، بزانێت چ هەڵوێستێکی بەرپرسانە دەگرێتە بەرو، چیشی دەکەوێتە ئەستۆ ؟!

هیوادارین بە خوێندنەوەی ئەم بابەتانە، زۆرینەی لایەنەکانی ئیسلامان بۆ دەرکەوتبێت و ئاینەکەی خۆمان ناسیبێتەوەو، خۆشمان وا ئاراستە کەین، کە هەموو هەڵس و کەوتێکمان لەگەڵ ڕێنماییەکانی شەریعەتەکەماندا یەك بگرێتەوە.

## ڕێڕەوێك بۆ ڕوکنەکان:

پێنج ڕوکنەکان کۆڵەگەی تیۆرو کردەوەیی هەموو ئیسلامن، شایەتمان بناغەب تیۆری و کردەوەیی موسوڵمانێتیە، ئەو کەسەی بڕیاری لەسەر شایەتمان (لا الـه الا الله محمد رسول الله) نەدا بێت، کە هیچ پەرستراوێك، کە نییە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای گەورە و، محمدیشﷺ نێرراوی خوایە، بە موسوڵمان دانانرێت، بۆیە شایەتمان بە یەکەم ڕوکن دانراوە. چوار ڕوکنەکەی تریش هەر یەکەیان بناغەی لایەنەکانی تری ئیسلامن...نوێژ بناغەی تیۆرو کردەوەیی هەموو لایەنی پەرستنە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی، کە تەنها خوای گەورە شایانی پەرستنەو، هەر ئەویش چۆنیەتی پەرستنەکانی بۆ دیاری کردووین، چ خودی نوێژ بێت، چ زیکرەکانی تری خوا، وەك پاڕانەوەو قورئان خوێندن و تەسبیحات و...هتد، ئەم مانایانەش هەموویان لە نوێژەکەدا هەن، بۆیە پەرستن بە بێ نوێژ کردن هیچ نییە...

زەکاتیش: بناغەی تیۆری و کردەوەیی ئیسلامی لایەنی سامان و داراییە، سامان و ماڵ هی خوان، مرۆڤیش جێنشینی خوایەو بەکاری دەهێنێت (لە ئەسڵدا هی خۆی نییە) بۆیە پێویستە مرۆڤ سامانەکەی ـ بە پێی ئەو نەخشەو ڕێبازەی، کە خوا بۆی دیاری کردووە ـ بەکار بهێنێت، کەوا بوو زەکات بناغەی تیۆری و کردەوەی ئەم هەموو لایەنانەی کاروباری داراییە، ئەگەر کەسێك بە زەکات دان

خۆی تەسلیم بە خوای گەورە نەکات، ئـەوە هـیچ کاتێـك لایـەنی کۆکردنـەوەی سامان و خەرج کردنی، ناداتە دەست شەرعی خوا و تەسلیمی فەرمانی خوا نابێت.

ڕۆژوو بناغەی تیۆری و کردەوەیی خۆڕاگرتنـە لەسـەر ئـەو فەرمانانـەی خـوای گەورە، کە لە ئیسلامدا هـەن، خـوای پـەروەردگار، خـۆڕاگرتنی دەرونـی کردۆتـە دەروازەی چونە بەهەشـت، وەك خـۆی دەفـەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴾ الشمس/٩ـ١٠ واتە: ئەو کەسـە شـادو دڵخـۆش دەبێـت، کـە دەرونی پاك دەکاتەوەو دەرونی بەرز رادەگرێت. ئەو کەسەش کە دەرونی بە چـڵکی خراپەکاری ڕەش کردۆتەوە بە هیلاك دەچێت. هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ۝٤٠ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ﴾النازعـات/٤٠ـــ٤١ واتە: بەڵام ئەو کەسەی لە خوای خۆی دەترسێت و دەرونـی لـە نـەفس و نـەوس و هەواو هەوەس دەگرێتـەوە، بەهەشـت جێگەیـەتی... دەرون گرتنـەوە بریتییـە لـە پاراستنی دەرون لە نەوس و ئارەزووە حەرامەکان و دابین کردنی لەسەر خووڕەوشتی پیرۆزو بەرز، واتە ڕاگرتنی دڵ و دەرون لەسـەر هـەموو فەرمانـەکانی خـوا، بۆیـە ڕۆژوو گرتن بناغـەی تیـۆری وکردەوەیـی هـەموو ئەمانـەن... چـونکە ڕۆژوگـرتن خۆگرتنەوەیە لـە خـواردن و خواردنـەوەو بـەکارهێنانی ئـەو ئارەزوانـەی، کـە لـە بنەڕەتدا حەڵاڵن، ئەمەش بۆ مەشق پێ کردنی دەرونە، تا لە هـەموو کاروبـارێکی تردا خۆی ڕاگرێت...

حەج کردن: بناغەب تیۆری و کردەوەیـی ڕەنجدانـە بـۆ خـوا، ڕەنجـی گەشـت و تێکۆشان بە سامان خرج کردن لە پێناوی ڕەزامەندی خـوا، چـونکە خـوای مـەزن تێکۆشانی لە پێناوی خۆیدا ـ بە سامان و گیان ـ کردووە بە یەکێك لە فەرزەکانی سەر شانی موسوڵمان، حـەجیش خـۆ ڕاهێنانێکـە لەسـەر ئـەو تێکۆشـانە، بۆیـە پێغەمبـەرﷺلـە بارەیـەوە دەفـەرموێ: ((لکـنَّ أفـضلَ الجهـادِ حـجٌّ مَبْـرورٌ)) رواه

البخاری١ واتە: بەڵام باشترین جیهاد حەجێکی بێ هەڵەیە. هەروەها حەج ـ با حیکمەتی هەموو ڕوکنەکانیشی نەزانرێت ـ هەر بناغەی تیۆری و کردەوەیی پرۆگرامی سیاسی ئیسلامییە، چونکە ـ جگە لەوەی خۆ تەسلیم کردنە بە خوا ـ لە ڕواڵەتیدا ئەوە دەردەکەوێت، کە موسوڵمانان یەك ئوممەتن، حەج کردن هێمای خۆ تەسلیم کردنی مرۆڤە بە خوا، لە هەموو ئەو فەرمانانەی، کە فەرمویەتی، یان توخن نەکەوتنی ئەو شتانەی ئەو بەرهەڵستی لێ کردووە.

هەر یەکێك لەم ڕوکنانە خزمەتی ڕوکنەکانی تر دەکات، هەمووشیان بۆ چەسپاندنی لایەنەکانی تری ئیسلام پەروەردە دەکەن. حەج کردن لە پەرستنە هەرە بەرزەکانە، هەروەها ڕۆژوو، هەروەها زەکات، هەموویان هەر خزمەتی یەك کێشە دەکەن، ئەویش هەست کردنی موسوڵمانە بە بارودۆخی برا موسوڵمانەکانی تری، هەموشیان دیسان هەر خزمەتی ئەوە دەکەن، کە موسوڵمان بە هەموو کیانیەوە دەبێت خۆی تەسلیم بە خوای پەروەردگار بکات. بێ چەندو چوون، بێ گلەیی و بۆڵە بۆڵ، بەڵکو بێ ئەوەی بشزانێت حیکمەت لەم فەرزە، یان لەو قەدەغە کردنی ئەو کارە، یان ئەو خواردنە چییە؟!

بەم ڕوکنانەو بەوانەش، کە وەکو لق و چڵ لێیان جیا دەبێتەوە، کەسێتی مرۆڤی موسوڵمان پەروەردە دەبێت، تا وای دارێژێت بۆ ئەوە بشێت، کە بنیاتی ئیسلامەتی لەسەر ڕاگیر کرێت... بۆیە نابێت موسوڵمان وا بیر کاتەوە، کە دەتوانرێت ئیسلام ـ بێ ڕوکنەکانی ـ دامەزرێت! چونکە هەموو خانوویەك بە

---

١ـ دایکە عائیشە ـ خوا لێی ڕازی بێت ـ دەیگێڕێتەوە، دەفەرموێ: ((قلت یا رسول الله: نرى الجهاد أفضل العمل أفلا نجاهد؟ قال لكن أفضل الجهاد، حج مبرور)) أخرجه البخاري (٤٦٥/١) والبيهقي (٣٢٦/٤) وأحمد (٧٩/٦) من طريق عبد الواحد بن زياد ثنا حبيب بن أبي عمرة بلفظ قلت: ((يا رسول الله ألا نغزو ونجاهد معكم ؟ فقال لكن أحسن الجهاد وأجمله الحج حج مبرور)) قالت عائشة: فلا أدع الحج بعد إذ سمعته من رسول الله ﷺ.

مانەوەی پایەکانیەوە بەندە، تا پایەکان پانترو بەهێزتر داڕێژرێن و بمێنن، خانووەکە چاکتر خۆ دەگرێت و زۆرتریش دەمێنێتەوە، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر پایە، یان بناغەو دیواری خانوو ڕوخان، حەتمەن خانووەکەش دەڕمێت. کۆشك و تەلاری ئیسلامەتیش هەر وایە، لەم ڕوانگەوەیە، کە دەبێت پەروەردەی ئیسلامی لە زەمینەی ئەم ڕوکنانەدا بڕوێت، تا بتوانرێت ئیسلامی لەسەر ڕاگیر بکرێت، ئەمەی گرنگی ئەم پایانەی کە هەر هەموو ئیسلامەکەی لەسەر ڕاوەستاوە، ئیسلام بێ ئەمانە مومکین نییە، هەر وەکو چۆن مومکین نییە خانویەك بێ پایەو بناغەو دیوار دروست بکرێت .

بۆ ورد لێکۆڵینەوەو چاك تێگەیشتنی ئەم باسە بە باشمان زانیوە، کە پێنج پایەکە بە دوو بەرگ باس کەین: بەرگی یەکەم بۆ شایەتمان تەرخان کەین و، بەرگی دووەمیش بۆ چوار ڕوکنەکەی تر.

# بەشی یەکەم

## شیی کردنەوەی شایەتمان

### ڕێڕەوی باسەکان

١ـ پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((مَنْ شَهِدَ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شريكَ لَهُ، وأنَّ مُحَمَّداً عبدُهُ ورسولُهُ، وأنَّ عيسى عَبْدُ اللهِ ورسولِهِ وكلمتِهِ ألقاها إلى مريمَ وروحٌ مِنهُ، والجَنَّةُ حَقٌ، والنار حق؛ أدخلَهُ اللهُ الجَنَّةَ على ما كان من العملِ)) البخاري و مسلم واتە: هەر کەسێك شایەتی بدات، کە هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای پەروەردگار، خواش تەنهایەو بێ هاوەڵە، شایەتیش بدات، کە محمدﷺ بەندەو نێرراوی خوایە، هەروەها عیسا بەندەو نێرراوی خوایەو و ئەو وشەیە، کە بە خشیوێتی بە مەریەم، کە ڕۆحێکەو لە خواوەیە، شایەتی بدات، کە بەهەشت ڕاستەو دۆزەخ ڕاستە، هەر کارێکیشی کردبێت خوا هەر دەیخاتە بەهەشتەوە...

لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: ((مَنْ شهدَ ان لا الە الا الله وان محمدا رسولُ الله حرَّم الله تعالى جسدَهُ على النار)) رواه مسلم. واتە: هەر کەس شایەتی بدات، کە هیچ شتێك جگە لە خوای گەورە شایانی پەرستن نییە و محمد نێرراوی خوایە، خوای گەورە جەستەی لە ئاگری دۆزەخ قەدەغە دەکات و نایسوتێنێ.

هەروەها دەفەرموێ: ((اتاني جِبريلُ فَبَشَّرَني أنَّهُ مَنْ ماتَ مِنْ أُمَّتِكَ لا يُشْرِكُ بالله شَيئاً دَخَلَ الجَنَّةَ قُلتُ وإنْ زَنَى وإنْ سَرَقَ، قال: وإنْ زَنى وإنْ سَرَقَ، قلتُ: وإنْ زَنى وإنْ سَرَقَ ؟! قالَ: وإنْ زَنَى وإنْ سَرَقَ، ثُمَّ قالَ في الرابعةِ: عَلى رَغْمِ أنْفِ أبي ذَرّ)) رواه الشيخان واتە: جوبرەئیل هات و مژدەی دامێ، کە هەر کەسێك لە

ئوممەتەکەت بمرێت، بەس هاوەڵی بۆ خوا پەیدا نەکردبێت، دەچێتە بەهەشت، ووتم: ئەگەر زیناو دزیشی کردبێت، ووتی: با زیناو دزیشی کردبێت، ووتم: با زیناو دزیشی کردبێت؟! ووتی: با زیناو دزیشی کردبێت، لە چوارەم جاردا فەرمووی: جا با ئەبو زەڕ هەر لالوت بێت...

هەروەها دەفەرمویّ: (( ثِنْتَانِ مُوجِبَتَانِ، فقالَ رَجلٌ: يا رسولَ اللهِ ما الموجبتانِ؟ قال: مَنْ ماتَ يُشرِكُ باللهِ شيئاً دَخَلَ النَّارَ ومَنْ ماتَ لا يُشْرِكُ باللهِ شَيئاً دَخَلَ الجنَّةَ)) رواه مسلم واتە: دوو هەڵوێست ماف پێویست دەکەن. کابرایەك پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەو دوو هەڵوێستە چین ؟ فەرمووی: هەر کەسێك هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدات و بمرێت؛ دەچێتە ئاگری دۆزەخەوە، هەر کەسێکیش بمرێت و هاوەڵی بۆ خوا پەیدا نەکرد بێت دەچێتە بەهەشتەوە.

٢ـ ئەوەی سەرەوە، کە هێنرایەوە گرنگی ئەم ڕوکنە دەخاتە ڕوو، ئەوە دەسەلمێنێت، کە ئیسلام بێ ڕوکنەکانی دانامەزرێت، شایەتمانیش بۆ ئیسلامەتی وەکو ڕۆحە بۆ لەش، بۆیە هەر کارێك لەم سەرچاوەیەوە وەرنەگیرابێت پووچەڵەو لای خوا هیچ نرخێکی نییە، لەبەر ئەوەیە، ئەگەر کافر هەزاران کاری خێر ئەنجام بدات لای خوا سەنگی پوشێکی بۆ ناکرێت. وەك دەفەرمویّ: ﴿ وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُوا۟ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً مَّنثُورًا ﴾ الفرقان/٢٣ واتە: دامانەوە دەست ئەو کارو کردەوانەی، کە کردبوویانن، کە ئێمە کردبوومان بە تۆزو خۆڵ!!

تەنانەت موسوڵمانیش ئەگەر ئیشێکی کرد، دەبێت گیانی ئەم شایەتمانەی تێدا بێت، وەگەرنا، خوای گەورە وەری ناگرێت، وەکوﷺ دەفەرمویّ: ((إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى فَمَنْ كَانَتْ هِجْرَتُهُ إِلَى دُنْيَا يُصِيبُهَا أَوْ إِلَى امْرَأَةٍ يَنْكِحُهَا فَهِجْرَتُهُ إِلَى مَا هَاجَرَ إِلَيْهِ)) متفق عليه. واتە: حوکمی هەموو کردەوەیەك بە گوێرەی نییەتی دڵە، هەر کەسەش ویستێکی هەیە، ئەوی مەبەستی

خـواو پێغەمبەرەکـەیﷺ بێـت ئـەوە نییـەتی خـواو پێغەمبەرەکەیـەتی (و بـۆی دەنوسرێت) هـەر کەسـێکیش مەبەسـتی شـتێکی دنیـایی بێـت، یـان مەبەسـتی ئافرەتێك بێت بیخوازێت، ئەوەش نییەتەکەی هەر بۆ ئەوانەیە... یـان دەفـەرموێ: ((مَنْ تَعَلَّمَ عِلْماً مِمَّا يُبتغى بِهِ وجهَ اللهِ لا يَتَعَلَّمُهُ إلا لِيُصيبَ بِهِ عَرَضاً مِن الـدنيا لَمْ يَجِدْ عُرْفَ الجنَّةِ يومَ القيامةِ))[1] رواه ابو داود باسناد صـحيح واتـە: هـەر کـەس زانستییەك لەوانەی لەبەر خاتری خوان، فێر ببێت، تا دوایی بە سەروەت و سامانی دنیایی بگۆڕێتەوە لە ڕۆژی دواییدا بۆنی بەهەشتی بەسەردا نایەت.

٣ـ خوای گەورە لە مەدحی یـاوەرانی پێغەمبـەرداﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ ٱلتَّقْوَىٰ وَكَانُوٓا۟ أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا﴾ الفـتح/٢٦ واتە: خوا فـەرمانی پابەنـد بوونی بە شـایەتمانەکەوە پێـدان، قـابیلی ئـەوەش بـوون، بەڕاسـتیش پیـاوی ئـەو دەرچوون!

بە بێ ئەو شایەتمانە نە لە خواترسان دێتە دی، نە قبوڵ کردنی کارو کردەوەش، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾ المائدة/٢٧ واتە: خوا تەنها لە موسوڵمانە پارێزکارەکانی قبووڵ دەکات. بۆیە دەبێت ئێمەش لە هەموو شتێك زیاتر لەسەر شایەتمانەکە سوور بین، ئەوپەڕی هەوڵمان بۆ حاڵی بوون و چەسپاندنی ئەو بێت، چونکە هەر ئەو گرنگترین شتێکە، کە شایانی ئەوەیە تەمەنی خۆمانی بۆ سـەرف کەین. دەبێت بەو شێوەیەش بیزانیـــــن و لێـــــــی تێ بگەین، کە خوای گەورە ویستویێتی، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَٱعْلَمْ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا

[1]ـ (ئەبو داوود لە كتاب العلم/ كتابِ العلم، باب: طلب العلم لغير الله تعالى حديث٣٦٤٧ هەروەها ئیمامی ئەحمەدیش لە مەسنەدەکەی خۆی ڕیوایەتی کردووە ٢/٣٣٨ هـەروەها ئیبنـو ماجه لە السنن المقدمة، باب: الانتفاع بالعلم والعمل به حديث ٢٥٢ ـ و ـ)

ٱللَّهُ ﴾محمد/١٩ واتە: دە بزانە کە هیچ خوایەك نییە شایانی پەرستن نییە، جگە لە خوای گەورە. جا ئەگەر بە ڕێك و پێکی ئەم شایەتمانەمان وەرگرت و داواکاریەکانیمان هێنایە دی، حەتمەن ئەو بەروبوومەشیمان لێوە دەست دەکەوێت، کە خوای گەورە وەسفی کردووەو دەرهەقی فەرموویەیت: ﴿مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي ٱلسَّمَآءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِيٓ أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍۭ بِإِذْنِ رَبِّهَا ﴾ابراهیم/٢٤ـ٢٥واتە: وشەی حەق وەکو درەختی بەبەرهەمە، کە لق و پۆپەکانی بە ئاسماندا پەرش و بڵاوو ڕەگەکانیشی بە ناخی زەویدا ڕۆچوون، کە بەروبومی گەییوو وجوانی خۆی بە فەرمانی خوا لە هەموو کاتێکدا دەدات...

٤ـ دوو ڕستەکەی شایەتمان لێك جویٰ ناکرێنەوە، چـونکە بڕیـاری﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ تـەواو کـەری بڕیـاری محمـد (رسـول الله) یـە. چـونکە ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ هەروەکو دواتر شی دەکەینەوە چەندین فەرمان و نەهی پێوە بەنـدە، کـە بـە هـۆی پێغەمبەرەوە نەبێت نازانرێت، چەندەها ماف و ئەرك هەن، کـە ئـەو ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ فەرزی دەکەن، بەڵام ڕونکردنەوەی هەمووی، یـان دیـاریکردنی چـۆنیەتی و شێوازی ئەنجامدانی ئەوانە؛ هـاتنی پێغەمبـەران دەخوازێـت... سـەدان بەڵگـەی ئەقڵی و نەقڵی هەیە، کە پێغەمبەرێتی محمد ﷺ دەسەلمێنێت، کەوا بوو بە هـەردوو ڕستەکان شایەتمانەکە تەواو دەبێت، ئەمەشمان زیاتر لە ڕوونکردنەوەو شیکردنەوەی واتای ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾دا دەکەوێتە بەرچاو.

# باسی یەکەم

## مانای وشەی (اَلإلَهْ)

مانای وشەی (إله: ئەلف و لام و هاو) لە فەرهەنگەکانی زماندا ئاوا هاتووە:

أَلِهْتُ الی فلان: لای فلاّن کەس ئاسوودە بووم، دلْ ڕاحەتیم چنگ کەوت.

أَلِهَ الرَّجُلُ بِأَلَهُ: چووە پەنای کابراو بوو بە دراوسێی.

اِلَهَ الرَّجُلُ الی الرَّجُلِ: چونکە زۆر تامەزرۆی کابرا بوو، ڕووی هەر لەو کرد.

أَلِهَ الفَصيلُ بِأمِهِ: زۆر دایکی خۆش دەویست بۆیە هۆگری لای ئەو بوو.

لاَهَ يَليهُ لَيهاً: لەبەر چاو نەما، داپۆشراوە.

ڕێسایەکی زمانی عەرەبی هەیە دەڵێت: ئەو وشانەی یەك ڕەگو ڕیشەیان هەیە، پەیوەندی لە نێوان ماناکانیاندا هەیە، واتە ماناکانی بەیەکەوە پەیوەست دەبنەوە، کە تەماشای ئەو مانایانەی سەرەوەی (الـە) دەکەین ئێمەش هەست بەو پەیوەندیە دەکەین، کە وا لە نێوان ماناکانیدا. تێبینی بکە: من ناچمە پەنای هیچ کەسێك، یان نابمە هاوسێی کەسێك (بێ گومان گەر ناچار نەبووبم) تا خۆشم نەوێت و دڵم لای ئەو نەحەوێتەوە، کە دەشبینم لە خۆم بەدەسەڵاتترو بەهێزترە زیاتر حەز بە کەناری ئەو دەکەم و لە داڵدەی ئەودا هەست بە ئاسوودەیی دەکەم... بۆ خوای گەورەش وا دەبین، زۆر زیاتریش! خوا خاوەن تواناو دەسەڵاتی تەواوەو پەکی لە هیچ شتێك ناکەوێت، خاوەن بەزەیی و لوتفەو خۆشەویستە، بەندە حەز دەکات بچێتە کەناری ئەوو هانا بۆ ئەو ببات، تا چاکتر لێی نزیك بێتەوە زیاتر حەز بە دیداری دەکات و هۆگری کەناری دەبێت، خوا غەیبەو نابینرێت چەندین پەردەی

نەزانی و نەتوانی و ئیدراك نەكردن لە نێوان ئێمەو ئەودا هەیە. كەوا بوو كە وتمان: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ ئەوە دەگەیێنێت، كە دەڵێین: كەس نییە لە خۆشەویستیدا بیپەرستین پەنای ببەینە لاو دالّدەمان بدات و لە خۆیمان نزیك كاتەوەو ئاسودەییمان لای دەست كەوێت، مەگەر خوای گەورە... قورئانیش بەم سیفەتانەوە خوای كردگارو پەروەردگارمان پێ دەناسێنێت تا بیپەرستین:

١ـ ﴿أَلَا بِذِكْرِ ٱللَّهِ تَطْمَئِنُّ ٱلْقُلُوبُ﴾ الرعد/٢٨ واتە: ئیدی هەر بە زیكر و یادی خوایە، كە دڵ ئاسودە دەبێت. یان: ﴿فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ المائدة/٢٣ واتە: ئەگەر ڕاستێ دەكەن و موسوڵمانن، دە پشت بە خوا ببەستن...

٢ـ ﴿وَأَنَّهُۥ كَانَ رِجَالٌ مِّنَ ٱلْإِنسِ يَعُوذُونَ بِرِجَالٍ مِّنَ ٱلْجِنِّ فَزَادُوهُمْ رَهَقًا﴾ الجن/٦ واتە: بەڵێ لە مرۆڤدا پیاوی وا هەبوو پەنای دەبردە بەر پیاوی جنۆكە! ئەوانیش بە ترس و بیم هێندەی تریان بار دەكردن! یان: ﴿وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا﴾ الجن/١٨ واتە: مزگەوتەكان هی خوان، ئێوەش هاوار بۆ كەسی تری غەیری خوا مەبەن...

٣ـ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾ البقرة/ ١٦٥ واتە: ئەوانەی باوەڕیان هێناوە خوایان زۆر زیاتر خۆش دەوێت: ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ المائدة/٥٤ خۆشی دەوێن و ئەوانیش خوایان خۆش دەوێت، خۆشەویستی پێغەمبەریش لە پاش خۆشەویستی خوای گەورە دێت، ئەویش بەو ڕادەیە، كە خوای گەورە خۆی مۆڵەتی پێداوە، پێغەمبەرﷺ خۆی دەفەرموێ: ((أحِبُّوا اللهَ لِمَا يَغذوكُمْ بِهِ مِنْ نِعمَةٍ ، وأحِبُّوني

لِحُبِّ اللهِ ، وأحِبوا اهلَ بيتي لِحُبِّيِ)) الترمذي وحسنه[1] واتە: خواتان خـۆش بوێـت، چونکە ئەم هەموو نازو نیعمەتانەی پێ بەخشیوون، منتان خـۆش بوێـت، چـونکە خوا خۆشی دەوێم، کەس و کاری منتان خۆش بوێت چونکە من خۆشم دەوێن...

٤ـ﴿ قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّيٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٦٥﴾ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴾ الزمر/٦٤ـ٦٦ بڵێ هۆ گەلۆرینە، هەی نەفامینە، دەتانەوێت غەیری خوا بپەرستم؟! وەحی بۆ تۆش و بۆ ئەوانەی پێش تۆش هاتووە، کە ئەگەر هاوەڵ بۆ خوا بڕیار بدەیت هەموو کردەوەکانت هەڵدەوەشێتەوەو مایە پووچ دەبیت، حەتمەن دەکەویتە ڕیزی زەرەرمەندانەوە، شتی وا نەکەیت، خوای خۆت بپەرستەو خۆ بخە ڕیزی سوپاسگوزارانەوە.

ئەگەر یـەکێك لـە ماناکـانی زاراوەی (إلـه: خـوا) بـریتی بێـت لـە (المعبـود: پەرستراو) کە ئەمەش مانایەکی سەرەکیەتی، با بزانین وشەی (المعبود) خۆشی چـی دەگەیێنێت :

ڕەگ و ڕیشەی (عبـد: ع ب د) لە زمانەوانی عەرەبیدا بەم شێوەیەیە:

---

١ـ بەڵام شێخی ئەلبانی ـ رحمه الله ـ دەفەرموێ: أخرجه الترمذي والحاكم، ضعيف/ بڕوانە: ضعيف الجامع ١٧٦. ئاشکرایە کە بە زەعیف دانانی حەدیسەکە لە قەدرو ڕێزی ئەهلول البيت کەم ناکاتەوە، مەسەلەی حوکم لەسەر حەدیس کـارێکی زانـستی ڕووتـە، ئـەگینا خـۆ دەیـان حەدیسی تر لەسەر گەورەیی ئەهلول البيت لە بوخاری و موسلیمدا هەیە، لەسەر فـەزڵیان یـان لەسەر فەرز بوونی خۆشویستنیان. زانایان کتێبیـان لەسـەر ئـەم بابەتـە زۆر نووسـیوە وەکـو: ئیمامی ئیبنو تەیمیە: حقوق آل البيت بين السنة والبدعة / توێژینـەوەی ابـو تـراب الظـاهري، یان لە مجموع الفتاوى (ب٣ لا ٤٠٧) وە لە الوصية الكـبرى (لا ٢٩٧) یان لە (درجـات الـيقين لا ١٤٩) یان (اقتضـاء الصراط المستقيم لا ٧٣) یان (رأس الحسين) هەروەها ئیبنـول القـەییم لە (جلاء الافهام) یان تەفسیری ئیبنو کثير ٤٨٣/٣ و سەدانی تر... (و)

١ـ العبد: بەندە: كۆیلەیە: مرۆڤی كڕاوی پێچەوانەی مرۆڤی سەربەستە، خوای گەورە لەسەر زمانی موسا پێغەمبەر دەگێڕێتەوە:﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدتَّ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾ الشعراء/٢٢ واتە: هەرچی نیعمەتێكم پێ ببەخشیت بایی ئەوە نابێت تۆ بەنو ئیسرائیلیەكانت كردووە بە كۆیلەی خۆت.

٢ـ العبادە: پەرستن: گوێ ڕایەڵی كردنی فەرمانە (بە ئەنجامدان یان بە واز لێ هێنان) لەگەڵ ملكەچیدا. وەك خوای گەورە، كە دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعْبُدُواْ ٱلشَّيْطَٰنَ ﴾ یس/٦٠ واتە: ئەی نەوەی ئادەم، مەگەر من بەڵێنی ئەوەم لێ وەرنەگرتن، كە گوێڕایەڵی فەرمانەكانی شەیتان نەكەن و بۆی ملكەچ نەبن ؟!

٣ـ المعبد: مەزن و بەرێز: شاعیرێك دەڵێت: (اری المالَ عند الباخلین مَعْبَداً)واتە: ئەرێ من سەروەت و سامان دەبینم، لای پیسكەو چاوچنۆكان زۆر بەرێزە!

٤ـ عبد بە: لەگەڵێدا مایەوەو لێی جوێ نەبۆوە.

٥ـ ما عبدك عنی ؟ چی لە منی بەند كردوی ؟!

ئەگەر سەیری بنچینەی ئەم مانا جیاوازانەش بكەین، دەبینین پەیوەندی تەواو لە نێوان ماناكاندا هەیە: من كە بومە كۆیلەی كەسێك، هەر دەبێت بەردەوام لە خزمەتیدا بم و لەگەڵێدا بێم و بچم، حەتمەن دەبێت بە گەورەو مەزنی خۆشی دابنێم وگوێ رایەڵی فەرمانەكانی بم و بە ملكەچییەوە جێبەجێیان كەم، دەبێت واز لە سەربەستی و هەڵبژاردن و سەرپشكی خۆم بهێنم بۆ ئەو... كە مادام مانای وشەی (المعبود: پەرستراو) یەعنی: خاوەنێكی گوێ بۆ رایەڵ كراوی بە گەورەو

مەزن ناسراوە، کەوا بوو، کە دەڵێین: هیچ خوایەك نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە، یەعنی: نە هیچ خاوەنم غەیری خوای گەورە هەیە، نە گوێ ڕایەڵی کەسی تری غەیری ئەو دەکەم، نە کەسێکی تریش هەیە من ئەوەندەی ئەو بە گەورەو مەزنی بزانم، نە کەسیش هەیە هەمیشە لە خزمەتیدا بم، جگە لە خوای گەورە.

کو سەرنجیش دەدەینە قورئان دەبینین، کە ئەم سیفەتانە تەنها هی خوان:

١. ﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾الناس/١ـ٣ واتە: بڵێ: پەنا دەگرم بە خاوەن و پەروەردگاری خەڵکی، بە پاشای خەڵکی، بەخوای خەڵکی. هەروەها: ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾آل عمران/ ١٨٩ واتە: هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمیندان هەر هی خوای گەورەن .

٢. ﴿ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ﴾ آل عمران/٣٢ واتە: بڵێ: گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەری خوا بکەن یان: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ ﴾ النساء/٨٠ واتە: هەر کەس گوێ ڕایەڵ پێغەمبەرﷺ بکات، ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە.

٣. ﴿وَهُوَ ٱلْعَلِىُّ ٱلْعَظِيمُ ﴾ البقرة/٢٥٥ واتە: گەورەو مەزن، هەر خوایە.

٤. ﴿ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴾آل عمران/١٠٢ واتە: بە ڕاستی لە خوا بترسن و پابەند بن بە موسوڵمانێتیەوە، تا بە موسوڵمانێتیش بمرن...

بەرامبەر وشەی (الالوهیة: خوایەتی) وشەی (الربوبیە: پەروەردگارێتی) هەیە، (المعبود)یش بریتییە لە (الرب الالە) واتە هەم خاوەن و پەروەردگارە، هەم پەرستراویشە، بۆیە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ

ٱلنَّاسِ ۝٢ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ ﴾ الناس/١-٣ واتە: بڵێ: پەنا دەگرم بە خاوەن و پەروەردگاری خەڵکی بە پاشای خەڵکی، بە خوای خەڵکی. دەی با ئینجا بزانین وشەی پەروەردگار (الرب: راء، باء، باء) لە زمانەوانی عەرەبیدا بە چەند و چ مانایەك هاتووە:

١- رَبَّ الولدَ و ربَّ الضَّيعَةَ: منداڵەکەی پەروەردە کرد، بە خەم زەویەکەوە بوو (کێڵگەکەی بایەخ پێدا) .

٢- ربَّ فلانٌ قومَهُ: فلان کەس حوکمی هۆزەکەی کرد، رَبَبْتُ القَومَ: هێنامنە ژێر رکێفی خۆم(فلانٌ يَربُّ الناسَ) کابرا خەڵکی کۆ دەکاتەوە، بە شوێنی کۆبوونەوەکەش دەوترێت: (المَربُّ) .

٣- ربُّ الدَّار وربُّ الابِل: خاوەن خانووەکەو خاوەن وشترەکە. وەکو لە حەدیسدا هاتووە: ((أربُّ غَنَمٍ أمْ رِبُّ إبلٍ ؟))[1] ئایا خاوەن مەڕەکانیت یان خاوەن وشترەکان؟

سەرنجدە پەیوەندی نێوان ماناکان: دەبینیت ئەو کەسەی، کە خاوەن شتێکە بۆی هەیەو دەتوانێت وەپێش خۆیدا یان لێی خورێت، یان سەرکردایەتی بکات، دەسەڵاتی حوکمیشی بە سەریدا هەیە، خۆشی کارگێڕو بەڕێوەبەری ئەو شتەیەو سەرپەرشتی دەکات و بەخەمیەوەیەتی.

خوای پەروەردگاریش هەر وایە: خۆی کردگارو خولقێنەری هەموو شتێکەو هەر ئەو خاوەنی هەموو شتێکە، گەورەو مەزن و دەسەڵاتدارەو بە ماناکانی سەرەوەش پەروەردگارە، ئەو هەموو کاروباری گەردوون ژیان دەبیات بەڕێوە .

---

١- نوسەر هەر وا هێناویتیەوە بێ ئەوەی هیچ لەسەر دەقەکەی، یان سەنەدەکەی بدوێ، منیش هەر لە هیچ سەرچاوەیەکدا نەمدۆزیوەتەوە. واش بەناوبانگە کە ئەمە پرسیاری ئەبرەهەی حەبەشییە لە باپیری پێغەمبەرﷺ، ئەو کاتە لێ پرسی کە هاتبو کەعبە بڕوخێنێت...

گەر سەرنجیش بدەینە قورئانی پیرۆز، دەبینین ئەمانەی هەموو هەر بۆ خوای گەورەو بەکارهێناوەو بەس، وەك دەفەرموێ: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ الاعراف/٥٤ خولقاندن و فەرمان هەر لە دەست خوا دایە (واتە فەرمانی گەردونی و یاسا دانان) هەروەها: ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ الانعام/٥٧ حوکم دەرکردن هی خوایە و بەس. یان: ﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾ الفاتحة/١سوپاس بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیان. فیرعەونیش لە موسای دەپرسی: ﴿قَالَ فِرْعَوْنُ وَمَا رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٣﴾ قَالَ رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَآ إِن كُنتُم مُّوقِنِينَ﴾ الشعراء/٢٣-٢٤ واتە: فیرعەون ووتی: خوای پەروەردگاری جیهانیان کامەیە ؟! موسا فەرموی: خوای پەروەردگاری جیهانیان، خوای ئاسمانەکان و زەمینە و هەرچی، کە لە نێواندایە، دەی ئەگەر ڕاست دەکەن و باوەڕی یەقینیتان هەیە.

لەم لێکۆڵینەوەیەوە ڕون دەبێتەوە، کە کاتێك ئەو کەسەی، کە دەڵێت: (لا الە الا اللە) وەك ئەوەیە، کە بڵێت: نە کرد گارێك، نە پەرستراوێك، نە خاوەنێك، نە خۆشەویستێك، نە ئاسودەیی نە پەنایەك، نە دالدەدەرێك، نە دەسەلاتێك، نە مەزنێك، نە مل بۆ کەچ کراوێك هەیە، جگە لە خوای گەورە... بۆیە پشت بە خوا فەرزە(واجبە)، پەنابردنە بەر غەیری ئەو شیرکە... پەرستن بۆ ئەو نەبێت نابێ، نابێت بە هیچ شێوەیەکی بۆ غەیری ئەو ئەنجام بدرێت ... ئەو شایانی ئەو گەورەیی و پەرستنەیەو بەس... پەنا دەبرێتە بەر ئەو، چونکە هەر ئەو دەسەلاتی موتڵەق و ڕەهای بەرفراوانی هەیە، توانای ئەو سنوری نییە، لەبەر ئەوەشە، کە تەنها ئەو مافی یاسادانانی هەیە، ئەو حوکم دەکات و فەرماندان و بەرهەڵستی کردن تەنها هی ئەوە، کەس غەیری ئەو، مافی ئەوەی نییە شتێك حەلاڵ یان حەرام کات، کەسی غەیری ئەو بۆی نییە بەرنامەو ڕێبازی خەڵکی دیاری بکات، چونکە

هەموو سیفەتەکانی ئەو تەواون و تەنها ئەویش وایە... پاکی و بێگەردی بۆ خوا (سبحان اللە)...

هەر کارێك یان سیفەتێك لە مانەی سەرەوە بدرێتە کەسێکی تر، یان یەکێك بۆخۆی زەوت کات، یان ئیدیعای بکات، کە هەیەتی، بە کافر دەژمێررێت.پەروەردگاردەفەرموێ: ﴿ قُلْ إِنَّمَا حَرَّمَ رَبِّيَ ٱلْفَوَٰحِشَ مَا ظَهَرَ مِنْهَا وَمَا بَطَنَ وَٱلْإِثْمَ وَٱلْبَغْيَ بِغَيْرِ ٱلْحَقِّ وَأَن تُشْرِكُوا۟ بِٱللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِۦ سُلْطَٰنًا وَأَن تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴾الاعراف /٣٣، واتە: بڵێ: خوا هەموو کردەوەیەکی بەدو ناپەسەندی یاساغ کردووە، چ بە ئاشکرا بکرێت، چ بە پەنهانی، هەروەها هەموو جۆرەکانی گوناح و تاوان و دەستدرێژی ناهەق، دیسان یاساغی کردووە کەستان هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار بدەن، کە ئەو خۆی هیچ ئاماژەیەکی پێ نەکردبێت و، ئێوەش هیچ بەڵگەیەکتان لەسەری بەدەستەوە نەبێت، لە وانەی خوا ناردوێتیە خوارەوە، دیسان خوای گەورە ئەوەشی یاساغ کردووە، کە قسەیەك ـ کە خۆشتان نایزانن ـ بەدەم خواوە هەڵبەستن.

پاش ئەوەی مانای( لا الە الا اللە)مان زانی، پێویستە مانای وشەی (أشهد: بڕیار دەدەم) بزانین کە( أَشْهَدُ)لە زمانی عەرەبیدا بە سێ مانا هاتووە:[1]

---

١ـ گەر نوسەر بیگوتایە بە سێ تەوەرە مانا هاتوون، ڕەنگە زیاتر بیپێکایە، چونکە ماناکانی أشهدلە زیاترن، بۆ نموونە لە مانای (حَضَرَ: ئامادە بوو) + (رأى: بینی) = عَلِمَ: زانی،ئەمەشیان... دوای زانین :

(علَّم: فێری کرد) + (بیَّن: ڕوونی کردەوە) + (أقرَّ: دانی پێدا نا: ئیعتیرافی پێ کرد)= قضی ئەمە حەوت مانا، ئینجا (أقرَّ: ئیعتیرافی پێ کردو بڕیاری لەسەردا) + (قضی: داوەری کرد)= حَکَمَ: حوکمی دائەمەش هەشتەم مانای!! ئێرە جێگای ئەم باسە نییە ئەگینا ئایەتەکانیشم بەسەر هەر یەکێك لەم مانایانەدا دابەش دەکرد، تا بزانیت، کە دەڵێیت أشهدُ بە ڕاستی شایەتیت داوە یان هەر قسەی سەر زمانتە!! جا بزانە زمانی قورئان چەند قوڵ و بەهێزە لە داڕشتن و دەربڕینی مانادا، قەومیەکانیش ئەوەندە گێلن.(و)

١ـ بە مانـای بیـنین: وەك قورئـان دەفـەرموێ: ﴿يَشۡهَدُهُ ٱلۡمُقَرَّبُونَ ﴾ المطففـين/٢١ واتە: ئەوانەی نزیککراوەن، دەیبینن.

٢ـ بە مانای شایەتی دان: وەك دەفەرموێ: ﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾الطلاق/٢ واتە: با دوو کەسی دادپەروەرتان شایەتیەکە بدەن.

٣ـ بە مانای سوێند: وەك دەفەرموێ: ﴿إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةٗ فَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ﴾ المنافقون/١ـ٢ واتە: کاتێك دوو ڕوەکان دێن بۆ لات، دەڵێن: شایەتی دەدەین، کە تۆ نێرراوی خواییت ـ خوا خۆی دەزانێت کە تۆ پێغەمبەری خوایت ـ بەڵام شایەتی ئەوەش دەدات، کە دوو ڕووەکان درۆزنن. سوێند خواردنەکانیان دەکەنە قەڵغانی سەر سەریان!!

شەرعناسانی حەنەفی دەڵێن: هەر کەس بڵێت: ئەشـهەدو: بـە سـوێند لەسـەری حسێبە.

لەم مانایانەوە پەیوەندییەکی پتەو لە نێواندا هەیە: کەسێك کـە بڕیـار لەسـەر شتێك دەدات، ئامادەشە سوێندی لەسەر بخوات، چونکە لێی دڵنیا بووە، بۆیـە لـە حەدیسیشدا هاتووە: ((على مِثْـلِ الـشَّمسِ فاشْهَدْ أو دَعْ))[1] واتـە: شـتێك وەکـو خۆری ڕون لێت ئاشکرا بوو، ئینجا شایەتی لەسەر بدە، یان وازی لێ بهێنە...

---

١ ـ نوسەر دەفەرموێ: زەیلەعی هەر بەو لەفزانە لە کتـێبی (نَصْبُ الرایـة)کـەی خۆیـدا گێڕاویێتیەوە و فەرموویەتی: (بەیهیقی لە (السُنَن) ەکەیدا تۆماری کردووە) هەروەها حـاکمیش هەر بەو شێوەیە لە (المستدرك)ەکەیدا هێناویێتیەوە. بەڵام ئیمامی ئیبنو حەجەر ـ رحمـه الله ـ دەربارەی دەفەرموێ: (أخرجه ابن عدي بإسناد ضعيف، وصححه الحاكم فأخطأ. "بلـوغ المرام" (لا ٤٢٠) ط إحياء التراث) هەروەها بڕوانە: (رسالة لطيفة في أحاديث متفرقة ضعيفة" /

کەوا بوو هەر بەوەندەی کەسێك شایەتمان بێنێـت نابێتـە موسـوڵمان! چـونکە دەبێت لەگەڵ شایەتمانەکەیدا ئەم مەرجانەی تێدا هاتبنە دی:

١ـ باوەڕ کردن و قەناعەت کردن لە ناخی دڵ و دەروون و ژێرییـدا بـەوەی، کـە هیچ شتێك شایانی پەرستن نییە جگە، لە خوای پەروەردگار ..

٢ـ دەربڕین و ئاشکرا کردنی ئەو قەناعەت و بڕیارە بە زمان.

٣ـ دڵنیایی بنوێنێت و دوور بێت لە دوودڵ و ڕاڕایی.[1]

هەر کەسێك لەبەر هەواو فیز و لـوت بـەرزی خـۆی، بـە زمـان شـایەتمانەکەی نەهێنا؛ کافرە، ئەوی شایەتمانەکەی هێنا، بەڵام لە ناخیدا قەناعەتی بۆ دانەمـەزرا بوو ئەوە دووڕوو (مونافیق)ە.

مرۆڤ تا پێغەمبەرﷺ نەناسێت و پێوەی پەیوەست نەبێت؛ بە موسوڵمان ناژمێررێت، چونکە بە هۆی ئەوەوە دەبێت ئەو ڕێبازە بگرێتە بەر، کە لەگەڵ شایەتمانەکەدا یەك دەگرنەوە، ئەگینا مرۆڤ بێ پێغەمبەرﷺ گومڕا دەبێت، لە خوا ناسیندا دەکەوێتە سەرگەردانییەوە، لەبەر ئەوەیە، کە ناسینی پێغەمبەرﷺ بەقەدەر ناسینی خوای گەورە پێویستە، کەس مافەکانی خوای گەورە بە تەواوی نازانێت و پێیانەوە پابەند نابێت، ئەگەر پێغەمبەرﷺ نەناسێت و شوێنی نەکەوێت، لەم

محمد بن قدامة المقدسي (ص ٥٤) ط الثقافة) ڕیوایەتی تریـشی هەیـە کـە دەفـەرموێ: (علـى مثل الشمس فاشهد أو ذرّ))، بەڵام ئەمیش هەر زەعیفە الحاكم لە (المستدرك) ەکەکەی خۆیـدا ب٤/لا٩٨) هێناویتیەوە، هەروەها ڕیوایەتی تری (لا تشهد إلا على مـا يـضيء لـك كـضياء الشمس) ئەمیش هەر زەعیفەو شێخی ئەلبانی ڕەحمەتی دەربارەی دەفەرموێ: (حديث ضعيف) بڕوانە کتێبی (إرواء الغليل) ب ٨/لا ٢٨٢.

١ـ چونکە نوسەری ڕەحمەتی حەنەفی بوو (حەنەفیەکانیش لە عەقیدەدا ماتوریـدین) کـردار بەلایانەوە بەشێك نییە لە هەبوونی باوەڕ، چونکە لای ئەوانی تر هەبوونی باوەڕ بە سێ بەشـە: قەناعەتی دڵ بڕیاری زمان، کردەوە ئەنجامدان، ئیمامی شافیعی دەڵێ: هیچ یەکێك لەم سـێیە لە دوانەکەی تر دانابڕێن، کە دابڕان باوەڕ نامێنێت(و)

هۆکارەوەیە، کە خوای گەورە ئەو کەسە بە کافر دادەنێت، کە باوەڕ بە نێرراوان و پێغەمبەرانی تر و، بە پێغەمبەرێتی محمدﷺ نەهێنێت... خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤْمِنُ بِبَعْضٍ وَنَكْفُرُ بِبَعْضٍ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُوا۟ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ حَقًّا ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴾النساء/١٥٠-١٥١ واتە: ئەو کەسانەی کافرن و باوەڕیان بە خواو بە نێرراوەکانی نەهێناوە، دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان ڕێنمایی خوایی و نێرراوەکانیەوە، دەڵێن: باوەڕ بە هەندێك ڕێنمایی دەهێنین (کە تەعلیماتی خوان) باوەڕ بە هەندێك ڕێنمایی تر (کە هی پێغەمبەران خۆیانن) ناهێنین! ئەوانە نیازیان وایە لەو نێوانەدا ڕێبازێك بۆ خۆیان دروست بکەن، ئەوانە بە ڕاستی کافری ڕەها(مطلق)ن موتڵەقن...

دروشمی ئیسلامەتیش، کە بریتییە لە( أشهد أن لا اله إلا الله وأشهد أن محمدا رسول الله)، ناشێت و ناکرێت نیوەی یەکەم لە نیوەی دووەمی جیا کرێتەوە...

لە دوو کتێبی پێشوومانادا (اللـه)و (الرسول)[1] بەڵگـەی زۆرمـان لەسـەر خـوای گەورەو سیفەتەکانی ولەسەر پێغەمبەر ﷺ هێناوەتەوە، کەپێغەمبەرێتی محمـدﷺ دەسەلمێنن، بۆیە ئەم بابەتەمان بە درێژی باسکردووە، تا موسـوڵمان بـە دڵنیـایی تەواوە ئیسلامەکەی وەرگرێت و بزانێت، کە شایەتمانی هێنا چ ئەرکێکی دەکەوێتە سەر ..

---

١ـ ئالقەی یەکەم و دووەمی ئەم زنجیرەی نوسەرن، کە سێیەمەکەیان (الاسلام)ە و ئێمە لـە دوو تـوێی شـەش بەرگـدا (إن شـاء الله) پێـشکەشی دەکـەین، الحمـد لله کتـێبی (الله)ەکـە وەرگێڕراوەتە سەر زمانی کوردی و لە ساڵی ٢٠٠٣ وە لە نوسینگەی تەفسیر لە هـەولێر بـڵاو کراوەتەوە...

# باسی دووەم

## شایەتمان ڕوکنەکانی تریشە

بە زمان شایەتمان هێنان، دەبێت باوەڕ بوونیشی لەگەڵدا بێت بەو نادیارانەی،کە پێغەمبەرﷺباسی لێوە کردوون، لە ڕاستیدا شایەتمانەکە خۆشی باوەڕە بە نادیار، ڕاستە پێغەمبەرﷺدیارە، بەڵام باوەڕ بەوەی وەحی لە خواوە بۆ هاتووە، هەر غەیبە، دیسان لە ڕاستیدا شایەتمان ڕوکنەکانی تری باوەڕیش دەگرێتەوە: باوەڕ هێنان بە خوا، باوەڕ هێنان بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە نێرراوەکانی، بە ڕۆژی دوایی، بە قەدەر... بەم شەشەش دەوترێت: ڕوکنی باوەڕ، کە لە بازنەی شایەتمانەکەدایە، بۆیە هەر کەسێك شایەتمانەکەی بە کردەوە سەلماند، ئەوە پێنج ڕوکنەکەی تری باوەڕیش جێبەجێ دەکات، بۆیە ئەگەر کەسێك سەر ڕاستانە شایەتمانی هێنا، ئیسلام وای بۆ حسێب دەکات، کە باوەڕی بە ڕوکنەکانی تری باوەڕ هێناوە، چونکە بە ووتنی(لا الـه الا الله)؛ خۆی باوەڕ هێنانە بە یەکخواپەرستی خوای گەورە (التوحید)، ووتنی (محمد رسول الله)کەش باوەڕ هێنانە بە هەموو پێغەمبەران... هەر کەسیش باوەڕی بە پێغەمبەران هێنا واتە باوەڕی بەو فریشتانە هێناوە، کە پێغەمبەرﷺ باسی فەرموون، فریشتەی پەیام هێنەر بێت، یان ئەوانی تر.

هەر کەسیش باوەڕی بە خواو پێغەمبەران و بە فریشتەکان هێنا، بێگومان باوەڕ بە وەحیش دەهێنێت، ئەمەش باوەڕی بە کتێبە ئاسمانیەکان هێناوە... هەر کەسیش باوەڕی بە خواو بە پێغەمبەران و بە فریشتەکان و کتێبە ئاسمانیەکان هێنا، باوەڕ بە ڕۆژی دواییش دەهێنێت، چونکە باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی،

بەشێکە لە باوەڕ هێنان بە دەسەڵات و چاکەو دادپەروەری خوا، هەروەها پێغەمبەران و کتێبە ئاسمانیەکانیش هەواڵیان داوینێ و باسی قەزاو قەدەریان بۆ کردووین، کە لقێکە لە باوەڕ هێنان بە خوای گەورە... چونکە ئەوی باوەڕی بە زانستی هەربوو (ئەزەلی) و ویست و ئیرادەو دەسەڵاتی بێ هاوتای خوا هێنا، کە شت لە نەبووەوەو دێنێتە بوون و ڕوداوەکان دێنێت ودەبات، ئەوە خۆی لە خۆیدا باوەڕی بە قەدەر هێناوە...

شێواندن لە هەر ڕوکنێك لە ڕوکنەکانی باوەڕ ڕوو بدات، مانای وایە بناغەکانی باوەڕ هەرەسی هێناوە و باوەڕ ڕماوە! بە پێچەوانەشەوە باش تێگەیشتن لە ڕوکنەکان و باش پابەند بوون پێیانەوە، مانای وایە شایەتمانەکە پتەو ڕاگیراوەو خەم لە ڕمانی نابێت. جا با بۆ باشتر حاڵی بوون لە شایەتمان چەند خاڵێك لەسەر ڕوکنەکان ڕوون کەینەوە:

١ـ هەندێك لە موفەسسیرین (ئەوانەی قورئانی پیرۆزیان لێك داوەتەوە) ڕایان وایە، کە مەبەست لەو ئایەتەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴾ البقرة/٣ واتە: ئەوانەی باوەڕیان بە نادیار هەیە، مەبەست لە نادیار شەش ڕوکنەکەی باوەڕە، چونکە سەرچاوەی هەموو کارێکی نادیار لەو شەش ڕوکنانەوە سەری هەڵداوە ..

لەوانەیە کەسێك بڵێت: ڕاستە خواو فریشتەو ڕۆژی دوایی و قەدەر نادیارن، بەڵام خۆ پێغەمبەران و پەیامە ئاسمانییەکانیان نادیار نین! ئیتر چۆن باوەڕهێنان بەوانیش لە ڕیزی باوەڕ هێنانە بە نادیار؟!

ئێمە باوەڕ هێنانمان بە پێغەمبەران لە ڕیزی باوەڕ هێنان بە نادیار دانا، چونکە ئەو وەحییەی بۆیان هاتووە نادیارە، پەیامی پێغەمبەران واتە وەحی، نادیاری

خوایی، بۆیە باوەڕ هێنانش بە وەحی واتە باوەڕ هێنان بە نادیاری کتێبە ئاسمانیەکان.

ئەگەر کەسێك ووتی: نادیارەکان لەوە زۆرترن. لە وەڵامدا دەڵێین: ئەم نادیارانە سەرچاوەی هەموو نادیارێکی ترن: باوەڕ هێنان بە موعجیزەی پێغەمبەرانی پێشوو، باوەڕ هێنان بە هەبوونی جنۆکەو پەری، باوەڕ هێنان بە حەوت ئاسمان، بە فریشتەو بەهەشت و(بەیتول المعمور) و لەسەر ئەوانیشەوە عەرشی خوای گەورە، هەورەها رۆحی موسوڵمان کە بەرەو ئاسمانەکان بەرز دەبێتەوە، یان چوونی پێغەمبەرﷺ لە شەوی میعراجدا بۆ ئاسمانەکان بۆ خزمەت خوای گەورە...هتد: ئەمانە هەمووی بەشێکن لە قورئان، باوەڕ هێنان بە قورئان باوەڕ هێنانیشە بەمانە... باوەڕ هێنان بە ژیانی بەرزەخی نێوان گۆڕو قیامەت، بەشێکە لە باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی... بەم پێیە هەموو نادیارەکان دەچنەوە ناو بازنەی ئەو تەوەرە نادیارانەوە...

٢ـ ئەو حەدیسەی پێغەمبەرﷺ، کە لە پێشەکیەکەدا هێناومانەتەوە: ((... یا محمد أخبرني عَنِ الإسلام؟ فقَالَ رَسُول اللّهِ صلى الله عليه وسلم: الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا اللّه وأن محمدا رَسُول اللّهِ، وتقيم الصلاة، وتؤتي الزكاة، وتصوم رمضان، وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا قَالَ صدقت. فعجبنا له يسأله ويصدقه! قَالَ: فأخبرني عَنِ الإيمان ؟ قَالَ: أن تؤمن باللّه وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر؛ وتؤمن بالقدر خيره وشره قَالَ صدقت. قَالَ: فأخبرني عَنِ الإحسان؟ قَالَ: أن تعبد اللّه كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك...)) ئەمە باسی هەر شەش ڕوکنەکەی باوەڕی لە خۆ گرتووە...

قورئانیش پێنجیانی بەیەکەوە لە جێیەکداو شەشەمیشیانی لە جێیەکی تردا باس فەرمووە، وەك: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ

وَٱلْكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ﴾ البقرة/١٧٧ واتە: بەڵام چاکەخوازی ئەوەیە کە: باوەڕ بهێنیت بە خواو بە ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و کتێب و پێغەمبەران... هەروەها: ﴿قَبْلُ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴾النساء/١٣٦ واتە: هەر کەس باوەڕی بە خواو بە فریشتەو بە کتێبەکان و بە پێغەمبەران و بە ڕۆژی دوایی نەبێت، ئەوە بەڕاستی لە ناو تەنگ و تاریکی گومڕاییەکی زۆر ئاشکرادایە. یان: ﴿إِنَّا كُلَّ شَىْءٍ خَلَقْنَٰهُ بِقَدَرٍ ﴾القمر/ ٤٩ واتە: ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەو ڕادەی خۆی خولقاندووە. یان: ﴿مَآ أَصَابَ مِن مُّصِيبَةٍ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا فِىٓ أَنفُسِكُمْ إِلَّا فِى كِتَٰبٍ مِّن قَبْلِ أَن نَّبْرَأَهَآ ۚ إِنَّ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرٌ﴾الحديد/٢٢ واتە: هیچ ڕوداوێك لەسەر زەمیندا، یان هیچ شتێك لە ناو خۆتاندا ڕوو نادات، مەگەر لە لای خوای گەورە لە (لوحول المحفوظ) نوسراوە، پێش ئەوەی ڕووی پێ بدەین، ئەمەش کارێکە بۆ خوا ئاسانە. هەروەها: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾ التوبة/٥١ واتە: بڵێ: هەرگیزاو هەرگیز هیچ شتێکمان تووش نابێت، تا خوا بۆی نەنووسیبێن. دیسان دەفەرموێ: ﴿يَمْحُوا۟ ٱللَّهُ مَا يَشَآءُ وَيُثْبِتُ ۖ وَعِندَهُۥٓ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ الرعد/٣٩ واتە: ئەوەی کە خوا خۆی حەز بکات دەیسڕێتەوە، یا هی تری دەخاتە شوێن، سەرچاوەی هەموو زانستی و کتێبەکان لە لای خوای گەورەیە: ﴿وَكُلَّ شَىْءٍ أَحْصَيْنَٰهُ فِىٓ إِمَامٍ مُّبِينٍ ﴾یس/١٢ واتە: هەموو شتێکمان لە نوسراوێکی ڕوون و ئاشکرادا سەرژمێر کردووە...

لەوانەیە خوای گەورە، کە باسی ئەو پێنج ڕوکنەی بە جیا (لە دوو ئایەتەکەی پێشوودا) فەرمووە بێ ئەوەی باسی قەدەریشیان بخاتە پاڵ هەر لەبەر ئەوە بوو بێت، کە قەدەر بەشێکە لە باوەڕ هێنان بە خوای گەورە خۆی، چونکە مانای قەدەر ئەوەیە کە: خوا زانستی بە هەموو شتێك هەیە کە ڕوو دەدات، ویستیشی لەسەر ڕودانی هەیە، تواناشی بەسەردا دەشکێت، ئینجا نووسینی ئەمانە هەمووی لە (لوح المحفوظ)دا، کە ئەویش هەر جیهانی نادیارەو خوای گەورە خۆی دەزانێت چۆنە... کەوا بوو سەرچاوەی باوەڕ هێنان بە قەدەر بریتییە لە باوەڕ هێنان بە خوا، لەگەڵ ئەوەشدا، کە لە ئایەتی سەربەخۆدا ـ وەکو بینیشمان ـ باس کراوە...

٣ـ ئەم باوەڕ هێنانە دابەش بوون ناگرێتە خۆ، هەر کەس باوەڕی بە یەك ڕوکنی نەبێت وەك ئەوەیە، کە باوەڕی بە هەموو ڕوکنەکان نەهێنابێت...

باوەڕ هێنانیش بە خوای گەورە فەرزێکەو هەر دەبێت بهێنرێتە دی:﴿فَمَن يَكْفُرْ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسْتَمْسَكَ بِٱلْعُرْوَةِ ﴾ البقرة/٢٥٦ واتە: هەر کەس باوەڕی بە تاغووت نەکرد و شوێنی نەکەوت، لە بەرامبەریشدا باوەڕی بە خوا هێنا، ئەوە دەستی بە ئایینە پتەوەکەی خواوە گرتووە...:﴿ مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾ النحل/١٠٦ واتە: هەر کەسێك پاش باوەڕ هێنانی بە خوای گەورە کافر بووەوە ـ جگە لەو کەسەی بە زۆر ناچار دەکرێت خۆی بە کافر دانێت، بەڵام دەبێت خۆی دڵی هەر بە باوەڕ ئاوەدان مابێت ـ ئەوانەی بە کافر بوونیان دڵخۆش دەبن، ئەوانە بەر غەزەبی خوا دەکەون...

باوەڕ هێنان بە پێغەمبەران هە ردەبێت بێتە دی: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١٥٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ ﴾ النساء/١٥٠ـ١٥١ واتە: ئەو کەسانەی کافرن و باوەڕیان بە خواو بە نێرراوەکانی نەهێناوە، دەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان ڕێنمایی خوایی و نێرراوەکانیەوە، دەڵێن باوەڕ بە هەندێك ڕێنمایی دەهێنین (کە تەعلیماتی خوان) باوەڕ بە هەندێك ڕێنمایی تر (کە هی پێغەمبەران خۆیانن) ناهێنین! ئەوانە نیازیان وایە لەو نێوانەدا ڕێبازێك بۆ خۆیان دروست بکەن، ئەوانە بە ڕاستی کافری تەواون... پێغەمبەریشﷺدەفەرموێ: ((والذي نفسُ محمدٍ بيدِه لا يَسْمَعُ بي أحَدٌ من هذه الأمةِ لا يهودي ولا نصراني ثم يموتُ ولم يؤمِنْ بالذي أُرْسِلْتُ بِهِ إلا كانَ مِنْ أصحابِ النَّارِ)) رواه مسلم واتە: سوێند بێت بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، هەر کەسێك لەم نەتەوەیە ـ جا جولەکە بێت یان دیان ـ باسی من ببیستێت و باوەڕ بەوە نەکات کە بە مندا نێرراوە، ئەوە دەچێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە...

هەردەبێت باوەڕ بە فریشتەش بهێنرێت، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ ﴾ البقرة/٢٨٥ واتە: موسوڵمانەکان هەموویان باوەڕیان بە خواو بە فریشتەکانی هێناوە... ﴿مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوّٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ ﴾البقرة/٩٨ واتە: بەڵێ: ئەو کەسەی دوژمنی خواو فریشتەکان و نێرراوەکانێتی، هەروەها دوژمنی جوبرەئیل و میکائیلە، کافرە، خواش دوژمنی کافرانە...

هەر دەبێت باوەڕ بە ڕۆژی دواییش بهێنرێت: ﴿ وَقَالُوٓاْ إِنْ هِىَ إِلَّا حَيَاتُنَا ٱلدُّنْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٢٩﴾ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذْ وُقِفُواْ عَلَىٰ رَبِّهِمْ ۚ قَالَ أَلَيْسَ هَـٰذَا بِٱلْحَقِّ ۚ قَالُواْ بَلَىٰ وَرَبِّنَا ۚ قَالَ فَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴾ الانعام/٢٩ واتە: ووتیان هەرچی هەیە هەر ژیانی دنیایە، خۆ زیندوو ناکرێینەوە، جا لە قیامەتتدا دەیانبینی وا لەبەر دەم خوادا ڕاوەستێنراوون، خوا پێیان دەفەرموێ: ئایا ئەم زیندو بوونەوەیەتان ڕاست دەرنەچوو ؟! ئەوانیش هەمووو دەڵێن: بەدی، بە خوا قەسەم ڕاست بوو، ئینجا خوا پێیان دەفەرموێ: دە مادام باوەڕتان نەهێنا، ئێستا سزاو ئازار بچێژن...

هەر دەبێت باوەڕ بە قەدەریش بهێنرێت، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لو أنَّ لأحدِهم مِثْلُ أُحُدٍ ذَهَباً فأنفَقَهُ ما قَبِلَهُ اللهُ عزَّ وجلَّ مِنهُ حتَّى يؤمِنَ بالقَدَرِ كُلِّهِ خَيرِهِ وشَرِّهِ)) رواه ابوداود وابن ماجه [1] واتە: ئەگەر یەکێکیان بەقەدەر چیای ئوحود زێڕی هەبێت و لەبەر خاتری خوا بیبەخشیایە، خوا لێی وەرناگرێت، تا باوەڕ بە قەدەر نەهێنێت... یان دەفەرموێ: ((لا يؤمِنُ عبدٌ حتى يؤمِنَ بالقَدَرِ خَيرِهِ وشَرِّهِ)) رواه الترمذي [2] واتە: باوەڕی ئەو بەندەیەی خوا تەواو نابێت تا باوەڕ بە خێرو شەڕی قەدەر نەهێنێت...

---

١ ـ ئیمامی موسلیم بەو دەقەی سەرەوەی بە حەدیس نەیگێڕاوەتەوە بەلکو بە قەولی عبداللە ی کوڕی عومەرؓ کە تابعینی هاتنە خزمەتی و دەربارەی گرووپی ئەلقەدەرییە (کە نەفی ئەوەیان دەکرد کە خوای گەورە هەمووو شتێکی نووسیبێت) لێیان پرسی، ئەویش فەرمووی: (( إذا لقيتم أولئك فأخبروهم أني بريء منهم وأنهم مني براء، والذي يحلف به عبد الله بن عمر، لو أن لأحدهم مثل أحد ذهبا فأنفقه ما قبله الله عز وجل منه حتى يؤمن بالقدر كله خيره وشره ))ثم استدل بقول النبي صلى الله عليه وسلم: ((الإيمان أن تؤمن بالله، وملائكته، وكتبه، ورسله، واليوم الآخر، وتؤمن بالقدر خيره وشره))رواه مسلم ٣٦/١ و ٣٧ (و)

٢ـ سنن الترمذي(٢١٤٤) وقال عنه: حديث غريب وصححه الألباني/ السلسلة الصحيحة (٢٤٣٩)).

کەوا بوو قابیل نییە هەر دەبێت باوەڕ بە سەرجەمی هەر شەش ڕوکنەکانی باوەڕ بهێنرێت، هەر کەسێکیش لێکی دابڕین کافرە...

جا چۆن ناشێت و ناکرێت ڕوکنەکانی باوەڕ لێك جودا بکرێنەوە، ناشێت و ناشکرێت لق و پەلی هەر ڕوکنێکیشیان لێك جودا بکرێنەوەو، بۆ نموونە:

باوەڕ هێنان بە خوا بریتییە لە باوەڕ هێنان بە بوون و سیفات و کردەوەو تەواوێتی خوای گەورە، خۆ ناشێت یەکێك لەمانە ئینکاربکرێت، یان باوەڕ بە بوونی نەکرێت! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ ﴾ محمد/١٩ واتە: دە بزانە کە هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت جگە لە خوای گەورە. یان: ﴿أَلَمۡ يَعۡلَم بِأَنَّ ٱللَّهَ يَرَىٰ ﴾ العلق/١٤ بۆچی نازانێت کە خوا دەبینێت ؟! یان: ﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾ البقرة/٢٣١ ئەوەش بزانن کە خوا بە هەموو شتێك زانایە.: ﴿ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾المائدة/٩٨ واتە: بزانن کە خوا سزاکانی زۆر توندو سەختن و لە هەمان کاتیشدا بە بەزەیی و میهرەبانە.: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ ﴾ الاعراف/١٨٠ واتە: خوا ناوە جوان و چاکەکانی هەیە، بەو ناوانەوە هاواری بکەنێ و لێی بپاڕێنەوە، لەو کەسانەش گەڕێن کە باوەڕیان بە ناوەکانی خوا نییە یان بەدرۆی دەخەنەوە و دژایەتی دەکەن: ﴿ ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٍ ﴾الرعد/١٦ خوا کردگاری هەموو شتێکە. ﴿كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٍ﴾الرحمن/٢٩ خوا ڕۆژانە لە وەدەم هاتنی پێداوویستی خولقێنراوەکانیدایە. ﴿فَلَمۡ تَقۡتُلُوهُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ قَتَلَهُمۡۚ وَمَا رَمَيۡتَ إِذۡ رَمَيۡتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰۚ ﴾ الانفال/١٧

واتە: ئێوە نەتان کوشتن، خوا بوو کوشتنی، تۆش کە تیرت دەهاویشت، خوا بوو دەیهاوێشت.

باوەڕ هێنان بە فریشتە: ئەمەش چەندین لق و پەلی لێ دەبێتەوە، وەك: سیفاتیان، توخمییان، کە(نە نێرینەن، نە مێیینەن)، لە ڕوناکی دروست کراون، لەشیان هەیە، نورانیشن، نەدەخۆن نەدەخۆنەوە، هەر فەرمانێکی خوایان بۆ دەرچێت، دەستبەجێ جێبەجێی دەکەن، شەو و ڕۆژ لە خواپەرستیدان، هەیانە زۆرتر باس کراوە، وەکو جوبرائیل و میکائیل و فریشتەی مەرگ(ملك الموت) یان فریشتەی بەرپرسی فوی کەڕەنا، هەڵگرانی عەرشی خوا، سەرپەرشتیارانی دۆزەخ، ئەوانەی شت دەپارێزن، هەروەها... یان کاروبارو ئەرکەکانیان باس کراوە، وەك هێنانی وەحی خوایی، نووسینی هەڵس و کەوتی مرۆڤ، نووسینی ڕۆزی و بژێو، بەرپرسێتی ئاکام (ئەجەل)، گیان کێشان، پرسیار کردن لە مردووی ناو گۆڕ، فوو کردن بە کەڕەنادا، پاسەوانێتی مرۆڤ ئامادە بوونی کۆڕی زیکرو یادی خواو دەرسی مزگەوت، قورئان خوێندن، یان ئەو فەرمانانەی تر، کە لە قورئان وحەدیسدا باس کراون... هتد.

باوەڕ هێنان بە کتێبە ئاسمانیەکان: ئەمیش بریتییە لە پەیامەکانی وەکو پەڕاوەکانی ئیبراهیم و تەوراتی موساو زەبوری داوودو ئینجیلی عیساو قورئانی محمد ـ سەلامی خوایان لێ بێت ـ. ئینجا کە قورئان هەموو ئەوانەی پێش خۆی سڕیوەتەوە، یان کە قورئان حەقەو لاری و چەوتی و هەڵەو نوقسانی تێدا نییە، یەك پیتی لانەدراوە، یان لێی نەگۆڕاوە، ئەم قورئانەی بەردەستی خەڵکی هەر ئەو قورئانەیە، کە بۆ پێغەمبەرﷺ هاتۆتە خوارەوە، یەك پیتی بۆ زیاد نەکراوە، وشەیەك نەخراوەتە جێی وشەیەکی، هەر وەکو سەرەتای هەر بە موعجیزەیی ماوەتەوە، حەڕامی ئەو حەرامەو حەڵاڵی ئەو حەلاڵەو، کەس بۆی نییە ئەو

حوكمانەی بگۆڕێت، هەروەها باوەڕ كردن و دڵنیا بوون لەوەی، كە تەنها ئەم قورئانە دەتوانێت ڕێگای ڕاستی و بەرنامەی ژیانی پارسەنگ نیشان مرۆڤایەتی بدات، ئەوی قورئان باسی فەرمووە، ئەو ڕاستەو بەس، چ دەربارەی عەقیدە چ دەربارەی خواپەرستن، چ لە سیستەم و یاساو ڕێسایدا، چ لە بنەماكانی ڕەوشت و ئادابی ڕەفتاردا... هەرچی نادیارێك، كە قورئان باسی فەرمووە حەقەو بوونی هەیەو باوەڕ پێ بوونی فەرزە، وەك جیهانی فریشتەو پەرییان و ئاسمانەكان و بەهەشت و دۆزەخ و پێغەمبەران و موعجیزەكانیان و ڕۆژی دوایی و نیشانەكانی ئاخر زەمان.. هەروەها باوەڕ هێنان بە فەرموودەكانی پێغەمبەرﷺ، كە ڕوونكەرەوەی قورئانن، بە بێ فەرموودە، ناكرێ نییە قورئان بە تەواوی لێك بدرێتەوە، یان ئەحكامەكانی ئیسلام داڕێژرێت، ئەمەش گەورە زانایان و شەرعناسە شارەزاكانی موسوڵمان دەتوانن پەیان پێ ببەن و حوكمیان لێوە وەرگرن، چونكە ئەوان زانیاریەكی بەرفراوانی قورئان و حەدیسیان هەیەو، شارەزای زمانی عەرەبین و سەر ڕاست و خاوەن تەقوان و، دەزانن بەرژەوەندی خەڵكی لە كوێدایە... ئینجا بشزانرێت كە وەرگرتنی ڕێبازو بەرنامەو دیدی غەیری قورئان و حەدیس" گومڕاییەو لە ئیسلام بە پاشگەزبوونەوە دەژمێررێت..

باوەڕ هێنان بە پێغەمبەران: ئەوە دەگرێتەوە، كە باوەڕیان بەو شێوەیە پێ بهێنرێت، كە قورئان باسی فەرموون، چ زۆر چ كەم، پاشان باوەڕ كردن بە ڕاستگۆییان، بە بێ هەڵەیی و لێهاتووییان، بە سەرڕاستییان لە گەیاندنی پەیامەكەی خوای گەورە بە قەومەكانیان... باوەڕ كردن بە ڕاستگۆییان ئەوە دەگەیێنێت، كە ڕەفتار و گوفتاری ئەوان پێوەری حەق و ناحەقییە، هەر كەس پێچەوانەی ڕەفتاری ئەوانی نواند لادەرو درۆزنە... لێهاتوویی پێغەمبەران یەعنی ئەوان پێشەوان و نموونەی ژیری پارسەنگ و تەواوێتی فام و پەی پێ بردنە... شوێن كەوتنی غەیری ئەوان ئەقڵ پێ نەشكان و گەلۆری و گومڕاییە.

باوەڕ هێنان بە ڕۆژی دوایی: ئەوە دەگرێتەوە، کە باوەڕ بهێنرێت بە نیشانەکانی دنیا ئاخر بوون و نیشانە سەرەتاییەکانی قیامەت: وەك گۆڕانکاریە گەردوونیەکان، یان هاتنی جەجاڵ(دجال)و دەرکەوتنی شتی سەیرو نامۆو ناسایی لەسەر دەستی، کە پالاَنتەی خوایەتی بۆ خۆی دەکات و هەندێك خەڵك شوێنی دەکەون، یان هاتنی یەئجووج و مەئجووج بۆ مەککە، هەروەها باوەڕ هێنان بە ژیانی بەرزەخی نێوان ژیانی دنیاو قیامەت، باوەڕ هێنان بە هەردوو جار فووکردنەکە بە کەڕەنادا، کە یەکەمیان هی مراندنی هەموو خولقێنراوانی سەر زەمینەو دووەمیان بۆ زیندوو بوونەوەیانە، ئینجا باوەڕ هێنان بە بەهەشت و نازو نیعمەتەکانی و بە دۆزەخ و ئەشکەنجەو سزاو ژانی... ئەمانەش هەمووی بەو شێوەیەی کە قورئان و حەدیسی سەحیح باسیان لێوە کردوون...

کەمترین پلەی باوەڕ هێنانیش ئەوەیە، ئەوانە بە ڕاست بزانرێت، هیچ گومان و دوو دڵی و ڕاڕاییەکیان تێدا نەبێت، بەڵکو گەیشتبێتە پلەی دڵنیایی تەواو، ئەگینا پێی ناووترێت باوەڕ، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا۟ ﴾ الحجرات/١٥ واتە: بڕواداران ئەوانەن، کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەرەکەی هێناوەو، پاشان گومانیان تێیدا نەماوە، دەنا ئەوە دووڕوویی (نیفاق)ە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ البقرة/١٠ نەخۆشی لە دڵ و دەروونیاندایە... خوای گەورە هەمیشە لە قورئاندا دووڕوویی بە نەخۆشی دڵ لێکداوەتەوە...

لێرەدا شتێك هەیە پێویستە ڕوونی بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە، کە گومانی دڵ بریتی نییە لە وەسوەسە! نا، گومانی دڵ بێ باوەڕییە، کوفرە، بەڵام وەسوەسە ئەوەیە کە شەیتان دەیهاوێتە دڵی یەکێکەوە، کە دڵ خۆی ڕەفزی دەکات و پێی خۆش نییە هەیبێت، بۆیە هیچ کارتێکردنی لەسەر باوەڕو ئەحکامەکانی نییە...

بۆ نموونە یەکێك موسوڵمانێك بۆ ڕێبازێکی کوفر بانگ دەکات، ئەم کارە هێندە کاریگەری لەسەر ئەو موسوڵمانە نابێت، ئەگەر موسوڵمانەکە خۆی لە بەرامبەریدا شل نەبێت و خۆی وەڵامی بانگەوازەکەی نەداتەوە، وەسوەسەی شەیتانیش هەر وایە، مادام دڵ بە تیشکی باوەڕو خوا ویستی ئاوەدانە؛ بانگەوازی شەیتان و وەسوەسەکەی هیچ کارتێکردنێکی نییە...

حەدیسەکەی ئەبو هورەیرەش(ﷺ)کە گێڕاویێتیەوە، هەر بەم شێوەیە، ئەوەی، کە دەفەرموێ: ((وجاء ناس من الصحابة فقالوا: یا رسول الله: إنـا نجِدُ في أنفسِنا ما يَتَعَاظَمُ أحَدُنا أنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ (أي: يراهُ عظيماً) فقالَ النبي صلى الله عليه وسلم: أَوَجَدْتمُوهُ؟. قالوا: نَعَمْ. قال: ذاكَ صريحُ الإيمانِ)) رواه مسلم [1] واتە چەند کەسێك لە یاوەرانی پێغەمبەرﷺ هاتنە خزمەتی و ووتیان: ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە لە دڵ و دەروونماندا هەست بە شتێك دەکەین، هێندە بەلامانەوە گەورەو خەتەرە، کە ناوێرین دەری بڕین! فەرمووی: هەستتان پێ کردووە ؟! ووتیان: بەڵێ، فەرموی: دە ئەوە ڕاشکاوێتی باوەڕە، ئەوە یەقینی باوەڕە... لە ڕیوایەتێکی تردا فەرمووی: (الحمد لله الذي ردَّ كيدَهُ إلى الوسوسة) رواه مسلم وأبو داود، واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی تەگبیرەکەی گەڕاندەوە بۆ وەسوەسە. هەر بەم جۆرەش لەو حەدیسەی ئیبنو مەسعوود تێدەگەین، کە دەفەرموێ: ((قالوا یا رسول الله إن أحدَنا يجدُ في نفسِهِ ما لَئِنْ يحترِقَ حتى يصيرَ حَمَمَةً أو يخِرُّ من السماءِ الى الارضِ أحَبُّ إليهِ أنْ يتكلَّمَ بهِ، فقالَ: أوقَدْ وجدتموه؟ قالوا: نعم، قال: ذاك صريحُ الإيمان))رواه مسلم [2] واتە: ووتیان:

---

١ ـ مسلم، كتاب الايمان، باب بيان الوسوسة في الايمان وما يقوله من وجدها (١٣٢) (و).

٢ـ نە لە سەحیحی موسلیم و نە لە موختەسەرەکەی المنذریدا ئەم حەدیسەم بەم لەفزانە نەدۆزیەوە ئەویان کە بە (ذاك صريح الايمان) کۆتایی هاتووە ((أو يخِرُّ من السماءِ الى الارضِ) تێدا نییە، لە ئەبو هورەیرەوەیەو بەم شێوەیەیە: (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ جَاءَ نَاسٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَسَأَلُوهُ إِنَّا نَجِدُ فِي أَنْفُسِنَا مَا يَتَعَاظَمُ أَحَدُنَا أَنْ يَتَكَلَّمَ بِهِ قَالَ وَقَدْ وَجَدْتُمُوهُ قَالُوا نَعَمْ قَالَ ذَاكَ صَرِيحُ الْإِيمَانِ)). صحيح مسلم بشرح النووي ٢/ ١٥٣ (و).

ئەی پێغەمبەری خوا، هی وامان هەیە کە شتی وا لە دڵیدا دروست دەبێت، کە ئەگەر کڵ و کۆی دامرکێ و ببێتە خەڵوز، یان لە ئاسمانەوە فڕێ درێتە سەر زەوی، لای خۆشترە وەك لەوەی بیدرکێنێت، فەرمووی: ئەوە دڵنیایی باوەڕە...

پێیان ناخۆش بووە دەری ببڕن و نەشیان زانیوە ئاخۆ چییە، چونکە دڵیان ئەو وەسوەسەی بوغزاندووە و پێیان ناخۆش بووە دەری ببڕن، خوای گەورەش دەفەرموێ:﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوْاْ إِذَا مَسَّهُمْ طَٰٓئِفٌ مِّنَ ٱلشَّيْطَٰنِ تَذَكَّرُواْ فَإِذَا هُم مُّبْصِرُونَ ﴾الاعراف /٢٠١ واتە: ئەو کەسانەی تەقوایان هەیەو لە خوا دەترسن، ئەگەر شەیتان خستنیە بەدی و خراپەکارییەوە؛ زوو خوایان دەکەوێتەوە یادو بەرچاویان ڕۆشن دەبێتەوە...

کەوا بوو حاڵەتی وەسوەسە جیاوازی هەیە لەگەڵ حاڵەتی گوماندا، کە دژی باوەڕ هێنانە، بۆیە ڕاستی باوەڕ کەمترین پلەیە، کە دەبێت مرۆڤ هەیبێت، تا خوای گەورە بە بەندەی پەرستیاری خۆی وەری گرێت...

٥ـ لەو کەمترین پلە باوەڕەوە، کە دەبێت مرۆڤ هەیبێت، بۆ سەرەوە پلەی تر هەیە، کە خەڵکی لە بۆ هەڵکشان و بەدەست هێنانیدا جیاوازن... موسوڵمان تا بە پلەکانی باوەڕدا زیاتر سەرکەوێت تەقوای زیاتر دەبێت:

أ ـ کەمترین پلەی باوەڕ هێنان بە خوای گەورە بریتییە لە بەڕاست زانین و یەقین. لەو بەلاتر بریتییە لەو لەزەت و خۆشییەی ئیمانداری سەرڕاست لە کەناری یادی خوا و نوێژەکانیدا دەیچێژێت، کە وا خوا بپەرستێت وەکو، کە لە خزمەتیدایت ودەیبینێت، وەك پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((أن تعبد الله كأنك تراه فإن لم تكن تراه فإنه يراك)) رواه مسلم و غيره واتە: وا خوا بپەرستیت کە هەر وەکو ئەوەی ببینیت، خۆ ئەگەر تۆش ئەو نەبینیت، ئەو تۆ دەبینێت... باشترین پێوەر،

کە باوەڕ بە ناوەکانی خوای گەورەی پێ بپێوڕێت ئەوەیە، کە مرۆڤ واتای ئەو ناوانە لە خۆیدا بچەسپێنێت، بۆ نموونە: هەر کەسێك لـە دڵ و دەروونـی خۆیـدا گەشـەی بەزەیی و سۆزی دا، ئەوە ناوو سیفەتی (الرحمن الرحیم)ی خوای گەورەی ناسیووە. ئەمە دەڵێین و بێ گومان ئەوەمان لەبەر چاوە، کە بەزەیی خوای گەورە لـە توانـای دەرك کردندا نییە، چ جای ئەوەی بتوانرێت بە بەزەیی مـەخلووق بـشوبهێنرێت... هەر بەم پێیە کـە نـاوو سـیفەتی ڕێـزو سـەخاوەت و بەخـشین لـە نـاوو سـیفەتی (الکریم)ی خوای گـەورەوە وەردەگیرێـت، مەبەسـت لەمەشـە کـە خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ﴾ الروم/٥٠ بڕوانە شوێنەواری بەزەیی خوایان: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً ﴾ الحج/٦٣ واتە: نابینیت خوا چۆن ئاوی لە ئاسمانەوە ناردۆتە خوارەوە؟.

ب ـ کەمترین پلەی باوەڕ هێنان بـە فریـشتەکان بەڕاسـت ناسـینیانە، چـونکە لەوانەیە دڵ و دەروونی هەندێ کەس هێندە پاڵفتە ببێت ـ دەرك بە هەنـدێك شـت بکات، کە کەسانی تر هەر لە باوەڕ بە نادیارەوە قەناعـەتیان پـێ کـردووە، بـەڵام ئەمانەی ـ خوای میهرەبـان دڵپـاك و پیاوچـاکی کـردوون ـ ڕوونـتر هەسـت بـەو نادیارانە دەکەن... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَىٰ نِسَاءِ الْعَالَمِينَ ﴾ آل عمـران/٤٢ واتــە: کــە فریشتە کان ووتیان: ئەی مەریەم، خوا تۆی هەڵبژاردووەو پاکژی کردوویتـەوەو لـە نێوان هەموو ئافرەتانی جیهاندا تۆی هەڵبژاردووە...

ئوسەیدی کوڕی حُضَیر(ﷺ) دەگێڕێتەوە ((عن أُسَيدِ بنِ حُضَيرٍ قـالَ بينمـا هـو يَقرأ مِن الليل سورة البَقرة وفَرَسُهُ مربوطةٌ عندَهُ إذ جالَتْ الفَـرَس فَـسَكَتَ فـسكَنَتْ فقرأ فجالَتْ، فسكت فسكَنَتْ ثم قرأ فجالت وكان ابنه يحيى قريبـا منهـا فانـصرف

فأخره ثم رفع رأسه إلى السماء فإذا مثل الظلّة فيها أمثال المصابيح فلما أصبح حدث النبّي فقال وتدري ما ذاك ؟ قال لا قال تلك الملائكة دنَتْ لصوتك ولو قرأت لأصبحتْ يَنظر الناسُ إليها لا تتوارى منهم)) رواه البخاري[1] واته: جارێك بەشەو قورئانی دەخوێند، ئەسپەکەشی لەولا خۆیەوە بەستبۆوە، کە سوورەتی بەقەرەی خوێند، لە پڕ ئەسپەکەی کەوتە جموجوڵ و بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە و هەوڵی دەدا خۆی ڕاپسکێنێت، ئەمیش لە قورئان خوێندنەکەی وەستاوە، ئەسپەکەشی هێدی بۆتەوە، بەڵام کە دەستی بە قورئان خوێندنەکەی کردۆتەوە، ئەسپەکەی دیسان وای کردۆتەوە، دەفەرموێ: ئەی پێغەمبەری خوا، یەحیای کوڕم لە نزیکییەوە بوو خەمم بوو بیکات بە ژێرەوە، بەڵام ئەو هەستاو ئەسپەکەی دوور خستەوە، پاشان ئوسەید سەری هەڵبڕیووە تەماشای ئاسمانی کردووە، پەڵەیەکی وەکو سێبەری دیووە، کە وا بە سەریانەوە وەستاوەو نورێکیش لە ناو سێبەرەکەدا وەك چرا دەدرەوشێتەوە، بۆ بەیانی کە دێتە خزمەت پێغەمبەرﷺ و ڕوداوەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، ئەویش دەفەرموێ: دەزانیت ئەوە چی بوو ؟! ئوسەید دەفەرموێ: نەخێر، پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ئەوە فریشتە بوون لە دەنگی قورئان خوێندنەکەی تۆ نزیك بووبوونەوە، گەر هەر بەردەوام بوویتایە لەسەر خوێندنەکەت، فریشتەکان ئەوەندە نزیك دەبوونەوە، کە خەڵکیش بیانبینن و تەماشایان بکەن، واش نەدەبوون دەرکەون و دیار نەمێننەوە...

هەروەها لە بەرائەوە‌ﷺ دەگێڕنەوە، کە جارێك ((كان رَجُلٌ يَقرأ سورةَ الكهف وعندَهُ فَرَسٌ مربوطٌ بِشَطنَين، فَتَغَشَّتْهُ سَحَابَةٌ، فَجَعَلَتْ تَدُورُ وتَدنُو، وجعلَ فَرَسَهُ

---

[1] ـ هەروەها ئیمامی مسلم والنسائي وأحمد والطبراني والحاكم گێڕاوینەتەوە، بەڵام بە لەفزی جیاواز. هەروەها: النسائي، وأبو نعيم، والبيهقي و أخرج الحاكم مثله (٤٣) وزاد :" إنك لو مضيت لرأيت العجائب ". (و)

يَنفِرُ منها، فلمَّا أصبحَ أتى الرسولَ صلى الله عليه وسلم، فَذَكَرَ لَهُ ذلك، فقالَ: تِلْكَ السَّكينةُ تَنَزَّلَتْ للقرآنِ)) رواه الشيخان واتە: کابرایەك سورەتی کەهفی دەخوێند، ئەسپەکەشی لەولایەوە بە دوو گوریسی ئەستوری تێك با هەڵدراو بەسترابۆوە، هەستی کرد وا پەڵە هەورێك دای دەپۆشێت وزیاتر لێی نزیك دەبێتەوە، ئەسپەکەی دەکەوێتە جموجوڵ، هەوڵی خۆڕاپسکان دەدات، کە ڕۆژ دەبێتەوە دێتە خزمەت پێغەمبەرﷺباسەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەویش دەفەرموێ: ئەوە هێمنی و ئاسوودەیی بووە لەبەر قورئان خوێندنەکە هاتۆتە خوارەوە.

حەنزەڵەی کوڕی الربيع الاسدي، کە نوسەرێکی وەحی پێغەمبەرﷺبوو، فەرمووی: ((لقيني أبو بكر، فقال: كيف أنت يا حنظلة؟ قال: قلت: نافق حنظلة، قال: سبحان الله، ما تقول؟ قال: قلت: نكون عند رسول الله صلى الله عليه وسلم يذكرنا بالنار والجنة، حتى كأنا رأي عين، فإذا خرجنا من عند رسول الله صلى الله عليه وسلم عافسنا الأزواج والأولاد والضيعات فنسينا كثيرا، قال أبو بكر: فوالله إنا لنلقى مثل هذا، فانطلقت أنا وأبو بكر حتى دخلنا على رسول الله صلى الله عليه وسلم، قلت: نافق حنظلة يا رسول الله، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "وما ذاك ؟" قلت: يا رسول الله، نكون عندك تذكرنا بالنار والجنة حتى كأنا رأي عين، فإذا خرجنا من عندك عافسنا الأزواج والأولاد والضيعات، نسينا كثيرا، فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: "والذي نفسي بيده، إن لو تدومون على ما تكونون عندي وفي الذكر لصافحتكم الملائكة على فرشكم وفي طرقكم، ولكن يا حنظلة ساعة وساعة" قالها ثلاث مرات)) أخرجه مسلم والترمذي. واتە: ئەبوبەکری سدديقم تووش بوو، چاك و چۆنی لێ کردم، ووتم حەنزەڵەی دووڕوویی کردووە. فەرمووی: سبحان الله، بزانە چی دەڵێیت؟! منیش ووتم: ئاخر ئێمە کە لە خزمەت پێغەمبەردا دەبین ﷺباسی دۆزەخ و بەهەشتمان بۆ دەکات، دەڵێی بە چاوی خۆمان دەیبینین، کەچی کە لە خزمەت ئەویش هەستاین و کەوتینەوە یاری و مەزاقی خێزان و منداڵ و مەشغەڵەتی زەوی و زارەکانمان زۆریمان هەر بیر دەچێتەوە، ئەویش

فەرموی: بە خوا منیش هەستی پێ دەکەم، ئەوجا هەردووکیان چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺو، بۆیان گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر بەو شێوەیەی، کە لەلای من دەبن هەروا بمێننەوە، هەر لە یادو زیکری خوادا بوونایە، فریشتە لەهەموو جێ و ڕێییەکانی خۆتان تەوقەی لەگەڵ دەکردن، بەڵام ئیتر ئەمەش هەر ساتە نا ساتە (ئەمەشی سێ جار دووپات کردەوە)..

ئا لەو کاتانەدایە، کە باوەڕ تێیاندا ساف وبێگەردو ڕوونە، ئەو ساتە ئیمانیانەیە، کە باوەڕ خاوەنەکەی بەرەو ئەو ئاسۆو دید ڕوونیانە بەرز دەکاتەوە، ئینجا لەگەڵ ئەم ساتی سەفای ڕۆحەدا هەبوونی عیلمی شەرعی وهەست وشەرم و دینداریەکەش بۆیان هەیە...

ج ـ کەمترین پلەی باوەڕ هێنانیش بە کتێبە ئاسمانیەکان بە ڕاست ناسینیانە، لەوەش بەرەو ژوورتر هەیە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَتْلُونَهُۥ حَقَّ تِلَاوَتِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ يُؤْمِنُونَ بِهِۦ﴾ البقرة/ ١٢١ واتە: ئەو کەسانەی کتێبەکەمان بۆ ناردوون و بەڕاستی دەیخوێننەوە، ئەوانە باوەڕیان پێیەتی... هەروەها: ﴿وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا﴾ الانفال/٢ موسوڵمانی ڕاستەقینە ئەوانەن، کە ئەگەر ئایەتەکانی خوایان بەسەردا بخوێنرێتەوە باوەڕو یەقینیان زیاد دەکات... یان: ﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ﴾الزمر /٢٣ واتە: خوا چاکترین وتەی ناردۆتە خوارەوە، کتێبێکی گەورەو مەزن، کە هەندێك بابەتی لێك دەچن، بەڵام شێواز جودا، ئەوانەی لە خوای خۆیان

دەترسێن موچوڕکیان پێدا دێت لێی، ئینجا بۆ یادی خوا دڵ گەرم و پێست نەرم دەبنەوە...

﴿ هُوَ ٱلَّذِیٓ أَنزَلَ عَلَیۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ مِنۡهُ ءَایَٰتٞ مُّحۡكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلۡكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٞۖ فَأَمَّا ٱلَّذِینَ فِی قُلُوبِهِمۡ زَیۡغٞ فَیَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِیلِهِۦۖ وَمَا یَعۡلَمُ تَأۡوِیلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِی ٱلۡعِلۡمِ یَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ ﴾آل عمران/٧

واتە: خوایە کە قورئانی بۆ ناردوویتە خوارەوە، کە ئایەتی وای تێدایە موحکەمن (بەڵگەو نیشانەکانی ئاشکران و هەموو کەس تێیان دەگات)، هەروەها ئایاتی تریش، کە موتەشابیهاتن (وەکو باسی نادیارو چۆنیەتی سیفاتی خواو... هتد) ئەو موسوڵمانانەی، کە باوەڕیان بە خوا هەیە تەسلیمی دەبن و باوەڕی پێ دەهێنن،چونکە دەزانن لە خواوە هاتووە، ئەمما ئەو کەسانەی، کە گومان و دوودڵ و ڕاڕان هەوڵ دەدەن دەمەوەری لەو ئایەتە موتەشابیهاتانەدا بکەن، بەو هیوایەی موسوڵمانان بە شەڕە قسەو ئاشووب و شتی بێ سوودەوە خەریك بکەن، گوایە ئەوانیش هەر قورئانەکە تەفسیر دەکەن! بەڵام خۆ خوای گەورە دەزانێت لێکدانەوەی چۆنە، زانا شارەزاکانیش دەڵێن: باوەڕمان بەوانە هەمووی هێناوە، چونکە لە لایەن خوای پەروەردگارمانەوە هاتووە .

هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِینَ أُوتُواْ ٱلۡعِلۡمَ مِن قَبۡلِهِۦٓ إِذَا یُتۡلَىٰ عَلَیۡهِمۡ یَخِرُّونَۤ لِلۡأَذۡقَانِ سُجَّدٗا ﴿١٠٧﴾ وَیَقُولُونَ سُبۡحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعۡدُ رَبِّنَا لَمَفۡعُولٗا ﴿١٠٨﴾ وَیَخِرُّونَ لِلۡأَذۡقَانِ یَبۡكُونَ وَیَزِیدُهُمۡ خُشُوعٗا ﴾ الاسراء/١٠٧ـ١٠٩ واتە: ئەو کەسانەی لە خاوەن پەیامە ئاسمانیەکانی پێشوو زانستیەکیان هەیە کاتێك قورئانیان لا دەخوێنرێتەوە سوجدە بۆ خوا دەبەن و سوپاسی دەکەن، چونکە ئەوەندە تەمەنە داونەتێ تا بە خزمەت پێغەمبەری ئاخری زەمان گەیشتوون دەڵێن: پاك وبێ

خەوشی بۆ خوای گەورە، بەڕاستی پەیمان و بەڵێنی خوا هەمووی بەجێن. ئەوجا لـە خۆشحاڵی و بەختەوەریدا ناوچەوانیان دەخەنە سـەر خـاك. دەگـرین و ملکەچـی و گوێ ڕایەڵی بۆ فەرمانەکانی خوا دەردەبڕن.

خەڵکی لە بەرامبەر قورئاندا جیاوازن هەندێکیان کە دەیخوێنن زۆر کاریـان تـێ دەکات و پێی ساڵح دەبن، دەڵێی ئەم وەحیە ئێستاو بۆ ئەوان دێـت، بۆیـە دەسـت بەجێ وەری دەگرن و ڕایدەپەڕێنن، هەندێکی تر کەمتر لەوان و هی تـریش کـەمترو کەمتر... ئیتر بە گوێرەی تواناو بڕی وەرگرتن و تێیداقاڵ بوونـەوە و پێـوە پابەنـد بوون و جێبەجێ کردنی ئەحکامەکانی.

کەمترین پلەی باوەڕ هێنان بە پێغەمبەرانیش ئەوە بوو کە دیتمان، لەوە بەدوا، خەڵکی تێیدا جیاوازن، هەیە کە دڵ و دەروونی پـڕ بـوو لـە بـاوەڕو خۆشەویـستی پێغەمبەرﷺ ئەوەندە دەکەوێتـە ژێـر کاریگـەری پێغەمبـەرەوەﷺ کـە خـۆی بـە قوربانی دەکات، شەخسیەتی خۆی لە شەخـسیەتی پێغەمبـەرداﷺ دەتوێنێتـەوە، خۆی لە عاستی ئەو زاتە بەڕێزەدا بە نەبوو دادەنێت، هی تریش هەیە وانینە، هـەر باوەڕی پێی هێناوەو بە گشتی حەز بە دیداری دەکات... بـەڵام هـەموو بەرپرسـن لەو بڕە خۆشەویستی و شوێن کەوتنەی کە پێغەمبـەرﷺ دەربـارەی فەرموویـەتی: ((لا يؤمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أكـونَ أَحَـبَّ اليـهِ مِـنْ والـدِهِ وولـدِهِ والنـاسِ أجمعـينَ)) رواه الشيخان والنسائي[١]. واتە: کەستان باوەڕی نابێت هەتا من خۆشەویستر نەبم لای لە باوك وکوڕو لە هەموو خەڵکی تر لە جێیەکی تردا دەفەرموێ: ((حتـى أكـونَ أَحَـبَّ

١ـ البخاري/ب١ لا ٩ باب: حب الرسول من الايمان١ و٢ والنـسائي ب ٨ ژمـارە ٥٠٣٠، لا: ٤٨٩

اليهِ مِنْ مالهِ وأهلِهِ))[1] واتە: تا خۆشەویستر نەبم لـە لای لـە سـەروەت و سـامان و کەس و کاری.

هـ ـ باوەڕ هێنانیش بـە ڕۆژی دوایـی هـەر وایـە، موسـوڵمان هەیـە هـەموو کاتێکی ڕۆژی دواییەو تێیدا دەژی و لە یادێتی، لە هۆش و گۆشـیدایە، لـە خـۆی دەپرسێتەوە، لۆمەی خۆی دەکات، خۆی هان دەدات، ژیـانی لـە قـالبێکی وادا دا دەڕێژێت کە لەگەڵ حەزی قیامەت و ڕووسووری لای خوای پەروەدگاریـدا بـسازێت ئیقتیدای زۆر بە پێغەمبەرەﷺ، سوننەتەکانی فێر دەبێت تا پێیەوە پابەنـد بێـت، ژیانی یاوەرانی پێغەمبەرﷺ سەرمەشقێتی، کـۆڵی ژیـانی سـووکەو هێنـدەی بـە کۆڵی خۆیدا نەداوە قیامەتی لە بیر ببەنەوە... بێ گومـان موسـوڵمانان لەمەشـدا ڕادەو بڕ جیاوازن... هەیانە بە تەواوی خۆی بۆ قیامەت ساغ کردۆتەوەو هەشـیانە کۆڵی دنیاشی قورس کردووە...

و ـ دیسان خەڵکی لە ڕادەو بڕی باوەڕ هێنانیان بە قـەزاو قـەدەریش جیـاوازن، هەیە ئەو حیکمەتە خواییە قەدەری هەمیشە لەبەر چاوە کە دەفەرموێ:﴿حَتَّىٰ بِٱللَّهِ وَبِرَسُولِهِۦ وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ وَلَا ٱلْأُمُورَ﴾ الحديد/٢٣ واتە: بۆ ئەوەی بۆ ئەو ڕابوردووەی لە دەستان چووە ڕەشبین و مـەئیووس بـن و، زۆریـش بـەوە دڵخـۆش نـەبن کـە داوینـەتێ... ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا﴾التوبة/ ٥١ بڵێ: هـەرگیز هـیچ شـتێکمان تـووش نابێـت ئەگـەر خـوا بـۆی نەنووسیبین. بۆیە ئەو کەسەی دڵی بە قەزاو قەدەر هێمنە، هەڵپەی دنیایی کەمـە، شەڕە پاڵی کەمە، بەو ڕۆزی و تەمەنەی خۆی ڕازییەو ویژدانی سرەوتووە، دەزانێـت

---

١ــ صحيح مسلم بشرح النووي ب ٣ لا ٢٧٥، و ب٤ لا ١٨٣ و مسند أحمد ب ٤ ذ: ١٣٤٩٩ لا: ١٨٣، وله النسائي بشرح السيوطي ب ٨، ذ ٥٠٢٩ لا ٤٨٨ (و) .

ئاکـــامی مـــردن هـــەر دێـــت: ﴿ أَيْنَمَا تَكُونُوا يُدْرِككُّمُ الْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِي بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ﴾النساء/٧٨ لە هەر کوێ بن مردن دەتاندۆزێتەوە با لە ناو قـەڵاو قوڵلـەی مەحکەمیـــشدا خـــۆ حەشـــار دەن! ﴿فَإِذَا جَاءَ أَجَلُهُمْ لَا يَسْتَأْخِرُونَ سَاعَةً وَلَا يَسْتَقْدِمُونَ ﴾الاعراف/٣٤ واتە: کە ئاکـامی مـەرگیان هـاتێ، نـە سـاتێك دوا دەکەون (لە ڕۆح کێشانیان) نە ساتێك پێش دەکەون!

ز- ئەم پلە بەرزو نزمانەی باوەڕ هێنان لە ڕاستیدا دەگەڕێنـەوە بـۆ مـەودای پتەوی و دڵنیایی مرۆڤ لە بڕیاری شایەتمانەکەی، تا مانـای شـایەتمانەکەی قـوڵترو فراوانتر بێـت، باوەڕیـشی پتـەوتر دەبێـت، پابەندیـشی بـە ئیـسلامەکەوە زیـاتر دەبێت...

لە ڕاستیدا هەر هەموو کارو کردەوەکانی کە باوەڕو (بـە شـەش ڕوکنەکەیـەوە) ئیسلام (بە هەر پێنج پایەکانیەوە) داوایان کردووە، بـریتین لـە ڕادەو بـڕو ئاسـتی چەسپاندن و جێگیر بـوونی شـایەتمان لـە دڵ و دەرون و هەسـت و هۆشـی کـابرای موسوڵماندا... ئاخر بۆیە شایەتمان بە سەرەتای دەست پێکردن و کۆتایی ئیـسلام دادەنرێت! لەبەر ئەوەشە کە لەو حەدیـسەدا کـە ئیمـامی موسـلیم و ئەحمـەد و ترمزی ریوایەتی کردووە، پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: ((مَنْ شَـهِدَ أنْ لا الـهَ الا اللهُ وأنَّ محمداً رسولُ اللهِ حَرَّمَ اللهُ جَسَدَهُ علـى النـارِ)) واتـە: هـەر کەسـێك شـاهێدی بدات، کە هیچ پەرستراوێك نییە شایانی پەرستن بێت، جگە لە خـوای گـەورە(الله) شایەتی بدات، کە محمدﷺ نێرراوی خوایە، خوا ناهێڵێلەشی ئـەو کەسـە لـە ڕۆژی دواییدا لە ئاگری دۆزەخ بسوتێ...

# بەشی دووەم

## لە بەرهەمەکانی شایەتمان

### ڕێڕەوی باسەکان

پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ ضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُهَا ثَابِتٌ وَفَرْعُهَا فِي السَّمَاءِ ﴿٢٤﴾ تُؤْتِي أُكُلَهَا كُلَّ حِينٍ بِإِذْنِ رَبِّهَا وَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَذَكَّرُونَ﴾ابراهيم/٢٤ـ٢٥واتە: نابینیت خوای گەورە چۆن نموونەی وشەی جوان و ڕێك و پێك بەدرەختێکی جوان و ڕێك و پێك دەهێنێتەوە، کە قەدی جێگیرەو ڕەگی بە زەویدا ڕۆچووە، لق و پۆپیشی بە ئاسماندا هەڵچووە، هەمیشە بە فەرمانی خوای خۆی بەرهەم و حاسڵاتی دەبەخشێت...

بەرهەمی (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) زۆر زۆرەو لە ژمارە نایەت، هەروەها ناوەرۆك و شوێنەوارو کارتێکردنەکانی ئەوەندە زۆرن، ئەستەمە دەرك بە هەموویان بکرێت، چونکە شتی نوێی ـ لە گەڵ زەمانەدا ـ لێوە وەردەگیریت.

ئێمە لێرەدا، دوای ئەوەی مانای شایەتمانەکەمان و ئەوانەی لێوەی جوێ دەبنەوە زانی، دەبێت باسی چەند شوێنەوارو خاڵێکی کارتێکردنەکانیشی بزانین، لەوەش دڵنیاین، کە هەرچی خێرو چاکە خوازی هەیە، لە ئیسلام و کۆمەڵگە ئیسلامیەکەدا هەی، هۆی سەرەکی ئەمەش ئەوەیە کە هەردووکیان لەسەر یەك بناغەو بنەما دامەزراون، کە شایەتمانەکەیە. بۆیە مەرج نییە لێرەدا زۆر لایەنی کارتێکردنی شایەتمانەکە بهێنینەوە، بەڵکو هەر هەندێکیان بخەینە ڕوو بەسە،

دەشتوانین ئەو لایەنانە هەڵبژێرین کە زۆر کەس لێیان بێ ئاگایە، یان بیریان چۆتەوە...

ئەگەر بزانین کە شەهید سەیید قوتبی رەحمەتی، دەربارەی ئەم مەسەلەیە چەند باسێکی جوان و گرنگی نووسیووە، جێی خۆیەتی ئێمەش چوار باس لەوانە لێرەدا بهێنینەوە... ئەو بە رەحمەت بێت باسی گەورەترین و کاریگەرترین خاڵی خوابەیەکناسینی کردووە، واتە شایەتمان... باسی ئەوەی کردووە، کە چۆن ئەو خوا بە یەکناسینە دەبێتە پرۆگرامی ژیان و چۆن ئەگەر کەسێك باوەڕی تەواوی لەسەر ئەو شایەتمانە ـ بەو ماناو ناوەرۆکەی ـ دامەزرا ئیتر هەموو هەڵس و کەوت و رەفتارێکی لەگەڵ بوون و گەردووندا یەکانگیر دەبێتەوە، بزاڤی ئەمان و ئەوان یەك خولگەی پێکەوە گونجاو دەگرنە بەر، دەسازێن و لێك دەوەشێنەوە. هەروەها ئەوەشی روون کردۆتەوە، کە چۆن ئەو وشەیە دەبێتە هۆی دامەزراندنی بەرزترین شارستانێتی و فراوانترین رۆشنبیری و رەسەنترین کلتوور... هەروەها سەربەرزی و مەزنییەك دەداتە شوێن کەوتووەکانی، چونکە لەسەر دادو هەقخوازی پەروەردەیان دەکات... موسوڵمانانیش پێویستە بە تەواوی دەرك بەم لایەنانە بکەن و لە دڵ و قەناعەتیاندا بچەسپێت... تا یەقینییان بۆ دروست ببێت کە کێشەی یەکەمی ئیسلامەتی بریتییە لە خوابەیەکناسین ..

با لە باسی یەکەمەوە دەست پێ بکەین:

# باسی یەکەم

## شایەتمان بەرنامەی ژیانە

خواپەرستی... ئەمە نیـوەی ڕوکـنی یەکـەمی شـایەتمانە، کـە بریتییـە لـەو عەقیدە ئیسلامییەی کەلە بڕیاری (لا الە الا اللە) دا دەردەکەوێت. نیوەکـەی تـری ئەم ڕوکنەش لە بڕیاری (محمد رسول اللە)دا دەردەکەوێت کـە بریتییـە لـەوەرگرتنی (خواپەرستی)یەکە، لە پێغەمبەرەوەﷺ.

دڵـی پڕبـاوەڕی موسـوڵمان ئەوەیـە کەئـەم ڕێـسا (قاعـدە)یـەی بـە هـەردوو بەشەکەیەوە تێدا چەسپی بێت. چونکە هەموو بنەماکانی تری بـاوەڕو ڕوکنـەکانی تری ئیـسلامەتی هـەمووی هـەر لـەم ڕێـسایەوە هەڵـدەهێنجرێت و لـق و چـڵی ئەون:باوەڕهێنان بەفریشتەکانی خواو کتێبە ئاسمانییـەکانی و پێغەمبـەران و ڕۆژی دوایی و خێرو شەڕی قەزاو قەدەرو نوێژو ڕۆژوو زەکات وحەج، هـەروەها سـزاکان و سـنوری حـەڵاڵ وحـەڕام و سـەوداو مامەڵـەی بـازاڕو ڕێـسادانان وتەوجیهاتـە ئیـسلامییەکان، هـەر هـەموویان لەسـەر ڕێـسای (خواپەرسـتی)دا دەمـەزرێن. سەرچاوەی لێ وەرگرتنیشیان پێغەمبەرەکەی خوایەو بەس.

کۆمەڵگەی موسوڵمانیش ئەوەیە کە ئەم ڕێسایەو هەموو لـق وچـڵەکانی تێـدا درەوشابێتەوە، چونکە نابێ هیچ کۆمەڵگەیەك بەکۆمەڵگەی ئیـسلامی دابنرێـت، کە ئەم ڕێسایەی تێدا نەدرەوشابێتەوە.

شایەتمان (لا الە الا اللە ومحمد رسول اللە) بناغەی بەرنامەیەکی تـەواوی ژیانـە. کە هەموو ژیانی ئوممـەتی موسـوڵمانی لەسـەردادەمەزرێت. ئەستەمیـشە ژیـانی ئیـسلامی بێتەکایـەوە پـێش ئـەوەی ئـەو ڕێـسایە چەسـپی بێـت... هـەروەها

ئەستەمیشە ژیانێك، کە لەسەر ڕێسایەکی تری غەیری ئەو ڕێسایە دروست بوو بێت و ئیسلامیش بێت! دیسان هەر زۆر زۆر ئەستەمیشە ژیانی ئیسلامی لەسەر ڕێسایەکی تر، یان چەندین ڕێسای تری شان بەشانی ڕێسای (لا الە الا اللە ومحمد رسول اللە) دابمەزرێت... مەحاڵە...

﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۚ أَمَرَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلۡقَيِّمُ﴾یوسف/٤٠
واتە: حوکم کردن تەنها هی خوایە کەفەرمانی داوە نابێ جگە لەو، هیچ شتێکی تر بپەرسترێت، ئەوەشە دینی ڕاست ودروست...

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَۖ﴾ النساء / ٨١ واتە: ئەوەی گوێڕایەڵی پێغەمبەر بکات.ﷺ ئەوە گوێڕایەڵی خوای کردووە.

لەم بڕیارە کورت وبنبڕو کاریگەرەوە چەند خاڵێك وەردەگرین کە هەڵوێستمانی - دەربارەی کێشە سەرەکییەکانی حەقیقەتی ئەم دینەو بزوتنەوە واقیعییەکەی ئیسلامی - لەسەردادەمەزرێت .

یەکەم: سروشتی کۆمەڵگەی موسوڵمانی پێ دەناسینەوە .

دووەم: پرۆگرامی پێکهێنانەوەی کۆمەڵگەی موسوڵمانی پێ دیاری دەکەین.

سێیەم: شارەزای بەرنامەو ڕێبازی ئیسلام دەبینەوە لەچۆنێتی ڕوبەڕو بوونەوەی کۆمەڵگە جاهیلییەکاندا...

چوارەم: فێری چۆنێتی ڕوبەڕو بوونەوەی ئیسلام دەبین لەگەڵ واقیعی ژیانی مرۆڤایەتیدا .

ئەمانەش کێشەی سەرەکین و زۆر گرنگن و لە بەرنامەی بزوتنەوەی ئیسلامی کۆن و نوێدا جێ بایەخن...

یەکەم دیاردەی ناسینەوەی سروشتی (کۆمەڵگەی موسوڵمان) بریتییە لەوەی، کە ئەو کۆمەڵگەیە لە هەموو کاروبارێکیدا، لەسەر ڕێسای (خواپەرستی) دادەمەزرێ، ئەو جۆرە پەرستنەی کە شایەتمان (لا الە الا الله ومحمد رسول الله)ی تێدا دەردەکەوێ، ئەم پەرستنەش لە بیروباوەڕ، دروشمی پەرستن١ ویاساو شەریعەتدا دەردەکەوێ...

١) ئەو کەسەی باوەڕی بە تەنهایەتی خوای گەورە نەبێ ئەوە بەبەندەی خوای تاك تەنها ناژمێررێت... خوای گەورە دەفەرموێ : ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ۝٥١ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ﴾ النحل/٥١ -٥٢ واتە: بڕیاری بونی دوو خوا مەدەن، چونکە خوا یەکەو هەر لەمنیش بترسن، خوا ئەوەیە، کە خاوەنی ئاسمانەکان و زەوی وهەرچی تێیاندایە، حوکم تایبەتە بەوەوە، ئایا ئێوە لەغەیری خوا دەترسن ؟

٢) ئەو کەسەی دروشمە پەرستنەکان لەبەر خاتری یەکێکیتری غەیری خوا بکات، ئەوکەسە بەبەندەی خوای تاك وتەنها ناژمێرری: ﴿قُلۡ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحۡيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ۝١٦٢ لَا شَرِيكَ لَهُۥۖ وَبِذَٰلِكَ أُمِرۡتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ﴾الانعام/١٦٢– ١٦٣ واتە: بڵێ نوێژم وپەرستنم وژیانم ومردنم بۆخوای پەروەردگاری جیهانە کەهیچ هاوەڵی نییە، منیش وا فەرمانم پێدراوە، ومنیش یەکەمین موسوڵمانم.

٣) ئەو کەسەی یاساو شەریعەت لەیەکێکی تری غەیری خواوە وەربگرێ و، لە غەیری ئەو ڕێگایەوە وەربگرێ، کە خوا خۆی پێی گەیاندوین، کە ڕێگای

١ دروشمی پەرستن وەك نوێژو ڕۆژو قوربانی کردن و... هتد (وەرگێر) .

پێغەمبەرەکەی خۆیەتی(ﷺ)، ئەوە ئەو کەسە بەبەندەی خوای تاك و تەنها ناژمێرری:﴿أَمْ لَهُمْ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ﴾الشوری/ ٢١واتە: یان هەڵبەتە خوا هاوەڵی وای هەیە، کە یاساو شەریعەتی تری بۆ ئەوان داناوە لەو بوارانەدا، کە خوا مۆڵەتی پێ نەداون: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾ الحشر/٧ واتە: پێغەمبەرﷺ چیتان بۆ دێنێ و پێی ڕازییە، وەری بگرن، بەرهەڵستی چیشی لێ کردن، وازی لێ بهێنێن.

کۆمەڵگەی موسوڵمان ئاوا دەبێ... ئەو کۆمەڵگەیەی، کە تەنها خوا دەپەرستێ، ئەوەیە، کە دەبێت ئەو خواپەرستییەی لە هەموو شتێکیدا دەربکەوێت: لە بیروباوەڕو هەست هۆشی تاکەکانی، لەدروشمی پەرستنەکانی و لەیاساو ڕێسا کۆمەڵکارییەکانیدا... هەر یەك لایەن لەم لایەنانە، دوا بکەوێ، یان لەسەر بناغەی (خواپەرستی) دانەمەزرێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ، کە هەموو ئیسلام لادراوە و، هەموو ئیسلام لە بووندا سڕاوەتەوە، چونکە ڕوکنی یەکەمی ئیسلام، کە (لا اله الا الله ومحمد رسول الله)ە کەیە، لاسەنگ بووە.

کە ووتمان: خوا پەرستی، لە بیروباوەڕدا دەردەکەوێ، دەبێ ئەوەش بزانین، کە داخۆ بیروباوەڕی ئیسلام چییەو چۆنە؟

بیروباوەڕ بریتییە لەو هەست وهۆشەی سەرەنجامی وەرگرتنی حەقیقەتەکانی عەقیدە، لە سەرچاوە خواییەکەیەوە دروست دەبێ، کە لە بیرو ئیدراکی مرۆڤدا پەیدا دەبێ، ئەوجا بەگوێرەی ئەوە، مرۆڤ هەست بەحەقیقەتی خوا دەکات و، بیرو هۆش و فیکری خۆی لەگەڵ دەگونجێنێ، هەروەها هەست بەحەقیقەتی ئەو گەردونە دەکات، کە تێیدا دەژی ـ دیارو نادیاری ـ هەروەها هەست بەحەقیقەتی ئەو ژیانە دەکات، کە ئەم سەریەوە ـ لەدیارو نادیاریدا ـ هەروەها هەست کردن بەحەقیقەتی

خۆی... واتە حەقیقەتی خودی مرۆڤ... ئینجا لەسەر بناغەو بەگوێرەی تەوجیهاتی ئەو بیروباوەڕە، ڕەفتاری لەگەڵ خوا دەگونجێنی بەشێوەیەك، کە (خواپەرستی)ی تێدا دەربکەوێ و...ڕەفتاری لەگەڵ گەردون وجیهانی زیندەوەران و، تاك وکۆمەڵ و دام ودەزگای مرۆڤایەتی دەگونجێنیٚ، بەشێوەیەك، کە هەموو سەرچاوەو ئەسڵێکی لە دینەکەی خوا وەردەگریٚ ـ بەو ڕێگایەی، کە پێغەمبەرﷺڕای گەیاندووە ـ تا وەکو(خواپەرستی)ی تێدا بچەسپیٚ... ئەو بیر و باوەڕەش بەم جۆرە هەموو چالاکییەکی ژیان دەگرێتەوە. ئەمە بوو ڕاڤەی ئایدیۆلۆژی ئیسلامی.

ئەگەر بڕیار لەسەر ئەوە درا کە (کۆمەڵگەی موسوڵمان) ئاوا دەبێت... دەبیٚ بزانرێت ئایا چۆن ئەو کۆمەڵگەیە پێك دێت و؟ ڕێبازی ئەو پێکهاتنە چۆنە ؟

ئەو کۆمەڵگەیە: کاتێك پێك دێت، کە کۆمەڵێك خەڵك بڕیاردەدەن، کە پەرستنی تەواویان بۆخوا بیٚ وبەس، بە هیچ جۆرێك هیچ پەرستنێکیان بۆ غەیری ئەو نەبیٚ... نەلەبیروباوەڕیاندا، نە لە دروشمی پەرستنیاندا، نە لە یاساو سیستمی حوکمیاندا. ئەوجا ئەو کۆمەڵە دەبیٚ بکەوێتە ڕێکخستنی هەموو گۆشەیەکی ژیانی بەگوێرەی ئەو بناغە تایبەتیەی خواپەرستن...دەبیٚ ئەو کۆمەڵە زەمیرو دڵ و دەرونیان پاك بکەنەوە، لە باوەڕکردن بە خوایەتی هیچ شتێکی تری غەیری خوا ـ لەگەڵی بیٚ یان کەمتر لەو ـ دەبیٚ دروشمی پەرستنەکانیان پاك بکەنەوە لەوەی لەبەرخاتری هیچ شتێك، یان کەسێك بکریٚ غەیری خوا ـ ئەو شتەش لەگەڵ خوابیٚ یان کەمتر لەو ـ، هەروەها دەبیٚ یاساو شەریعەتیان لەوە پاك بکەنەوە، کە لە غەیری خوا وەریبگرن ـ جا چ حوکمی یاساو ڕژێمێك بیٚ شان بەشانی تەعلیماتی شەریعەتەکەی خوا وەربگیریٚ، چ هەرلەیاساو ڕژێمێکی تر وەربگیریٚ وئیسلام بخرێتە لاوە .

ئەو کاتە ـ تەنها ئەو کاتەش ـ ئەو کۆمەڵە بە موسوڵمان دەدرێنە قەڵەم و، ئەو کۆمەڵگەیەی ئەو کۆمەڵە دروستی دەکات بە کۆمەڵگەی موسوڵمان دادەنرێ...

بەڵام پێش ئەوەی کۆمەڵێك خەڵکی بێن وبڕیاربدەن، کە تەنها خوا ـ بەو شێوەی باسکرا ـ دەپەرستن، ئەوە بەموسوڵمان نادرێنە قەڵەم، هەروەها پێش ئەوەی کۆمەڵێکی وا ژیانی خۆیان لەسەر بناغەی(خواپەرستی) ڕێك بخەن، کۆمەڵگەی موسوڵمانیان پێ نایەتە کایەوە... چونکە هێشتا یەکەمین ڕێسای ئیسلامەکەی لەسەر دەمەزراوە، ئەوی کە دەبێت کۆمەڵگەی موسوڵمانی لەسەر بنیات بنرێت، کە (لا اله الا الله وحمد رسول الله) کەیە، کە دەبێت بەهەردوو بەشەکەیەوە لەژیانی کۆمەڵێکدا بێتەدی...

کەوابوو پێش ئەوەی بیر لە دامەزراندنی سیستمی کۆمەڵایەتی ئیسلامی و، پێکهێنانی کۆمەڵگەی موسوڵمان ـ کە لەسەر بناغەی ئەو سیستمە دادەمەزرێ ـ بکرێتەوە... پێویستە یەکەم بایەخ بدرێ بە ڕزگارکردنی زەمیرو ویژدانی ئەندامانی کۆمەڵەکە لەپەرستنی غەیری خوا ـ لە هەر شێوەیکدا بێ لەو شێوانەی باسمان کردن ـ پاشان دەبێ ئەو ئەندامانەی زەمیرو ویژدانیان لە پەرستنی غەیری خوا ڕزگارکردووە، لە کۆمەڵە (الجماعة)یەکی موسوڵماندا کۆببنەوە... ئینجا لەم کۆمەڵەیەی ئەندامەکانی زەمیرو ویژدانیان لە پەرستنی غەیری خوا ڕزگار کردووە ـ لە بیروباوەڕو پەرستن ویاسا وەرگرتنیاندا ـ دەشێ کۆمەڵگەی ئیسلامی پێك بهێنرێت، ئەو کاتەش هەر کەس، کە ویستی لەو کۆمەڵگەیەدا بژی وە هەر کەس ڕازی بوو (بە عەقیدە و پەرستن ویاساو شەریعەتی ئەو کۆمەڵگەیە، کە لەسەر بناغەی (خواپەرستن) دامەزراوە، یان بڵێین، کە (لا الە الا الله ومحمد رسول الله)ی تێدا چەسپێنراوە، دێت ودەچێتە ڕیزی ئەندامانی ئەو کۆمەڵگەیەوە.

دروست بوونی یەکەمین کۆمەڵەی موسوڵمان، کە یەکەمین کۆمەڵگەی موسوڵمانی لێوە پێك هات، بەو شێوەیە بوو... بۆیە دروست بوونی هەموو کۆمەڵەیەکی موسوڵمان وپێکهاتنی هەموو کۆمەڵگەیەکی موسوڵمان، هەر دەبێ بەو شێوەیە بێ.

کۆمەڵگەی موسوڵمان لەوەوە پێك دێت کەخەڵکی ـ چ تاك بن چ کۆ ـ لە پەرستنی غەیری خواوە بێتە ڕیزی پەرستنی خوای تاك وتەنهای بێ هاوەڵ ـ جا چ لەگەڵی بێ چ لەو کەمتر... هەروەها لەوەوە پێك دێ، کە ئەم جۆرە تاك وکۆیانە بڕیار دەرکەن، کە دەبێ حکومەتێکی خۆیان هەبێ سەرەوکاری ژیانیان بکات، کە لەسەر بناغەی ئەو پەرستنە تایبەتییە دابمەزرێ... ئەو کاتە لەدایك بوونێکی نوێی کۆمەڵگەیەکی نوێ دێتەکایەوە، کە هەر لە کۆمەڵگە جاهیلییە کۆنەکەوە گوێزراوەتەوە، کە ئێستا ئەم وا ڕووبەڕوی بۆتەوە، بەڵام بەعەقیدەیەکی نوێ و، سیستمێکی نوێی ژیان، کە لەسەر بناغەی ئەو عەقیدەیە دامەزراوە، کە بریتییە لە بڕیاری (لا اله الا الله و محمد رسول الله).

لەوانەیە ئەو کاتەی ـ کە کۆمەڵگەی ئیسلامی پێك دێت ـ کۆمەڵگە جاهیلییە کۆنەکە، بە هەموو ئەندامەکانییەوە بێنە نێو ڕیزی کۆمەڵگە ئیسلامییە نوێکەوە، لەوانەشە نەیەن... یان لەوانەیە پەیمان لەگەڵ کۆمەڵگە موسوڵمانە نوێکە ببەستن، لەوانەشە بەربەرەکانێی بکەن، ئەگەرچی چەند وەختە مێژوی ڕێبازی خواویستی هەر وا بووە، کە کۆمەڵەی جاهیلی بەردەوام شەڕی سەختی لەگەڵ کۆمەڵگەی موسوڵماندا کردووە لە هەر هەموو قۆناغەکانی دروست بوونیدا ـ چ تاك تاك بوبن چ کۆمەڵ ـ هێرشی گەورە گەورەی هێناوەتە سەر پێشڕەوانی ئەو کۆمەڵگە نوێیە... ئەمەش ناکۆکییەکە، کە بەدرێژایی مێژوی بانگەوازی ئیسلامی ڕویداوە، هەر لە کاتی نوحەوە ـ سەلامی خوای لی بێت ـ تا کاتی محمدﷺ بێ جیاوازی .

شتێکی بەڵگەنەویستە، کە کۆمەڵگە نوێکەی موسوڵمانان، نەدادەمەزرێت و نەبڕیاری بوونیشی دەدرێت و، دانی پێدادەنرێت، تا نەبێتە خاوەن هێز... هێزی بیروباوەڕو هێزی خووڕەوشت وورەبەرزی و، هێزی ڕێکخستن وبونیادی کۆمەڵکاری و هەموو جۆرە هێزەکانی تر، کە ئەو کۆمەڵگە موسوڵمانە دەگەیێنێتە ئەو ڕادەیەی بتوانێت بەسەر کۆمەڵگەی جاهیلیدا زاڵ ببێت، یان هەر هیچ نەبێت هێزێکی وابێت توانای ئەوەی هەبێت، کە تەوژم وتینی کۆمەڵگەی جاهیلی ڕاگرێ و بەرهەڵستی بکات .

بەڵام ئایا (کۆمەڵگەی جاهیلی) چییە؟ پرۆگرامی ئیسلامی لەڕوبەڕو بوونەوەی ئەو کۆمەڵگە جاهیلیانەدا چۆنە؟

کۆمەڵگەی جاهیلی هەموو کۆمەڵگەیەکی غەیری کۆمەڵگەی موسوڵمان دەگرێتەوە! ئەگەر ویستمان بەشێوەیەکی بابەتی کۆمەڵگەی جاهیلی پێناسە بکەین دەڵێین: کۆمەڵگەی جاهیلی بریتییە لەهەموو کۆمەڵگەیەك، کە (تەنها خوا پەرستن)ی تێدا نایەتەدی، چ لەبیروباوەڕیدا، چ لە دروشمی پەرستنیدا، وە چ لە یاساو شەریعەتیدا. بە پێی ئەم پێناسە بابەتیەش هەرچی کۆمەڵگەیەك، کە ئەمڕۆ لە سەرزەمیندا هەیە بە (کۆمەڵگەی جاهیلی) دەژمێررێ.

کۆمەڵگەی کۆمۆنیستی (شیوعی) جاهیلییە... چونکە یەکەم: لە بیروباوەڕیدا باوەڕی بەخوای گەورە نییە، ئینکاری بونیشی دەکات، بەوەی کە کارگێڕی بوونەوەر دەداتە دەست (مادده) یان (سروشت) و کاروکارتێکردنی ژیان و مێژوی مرۆڤ دەداتە دەست (ئابوری) یان (ئامێرەکانی بەرهەم هێنان). دووەم: ڕژێمێکی دامەزراندوە- یان دایدەمەزرێنێت - کە حزبی تێدا دەپەرسترێت (ئەگەر ڕاست بێ و سەرکردایەتی کۆمەڵکاری ( القیادة الجماعیة) حەقیقەتێکی واقیعی هەبێ و وابێت) نەك بۆ خوای مەزن! هەروەها هەرەمییەکی تر، کە دەکەوێتە ئەو جۆرە

بیرو هۆش وئەو جۆرە رژێمەوە وەك بە فیرۆچوونی سیفاتی (مرۆڤ) بەو ئیعتبـارەی، کە(داواکارییە سەرەکییەکان)ی تەنها داواکاری ئاژەڵین، کـە بـریتین لـە: خـۆراك و خواردنەوەو جێگاو تێرکردنی ئارەزوی جنسی (سێکس)، هەروەها مەحروم کردنـی مرۆڤ لەهەموو پێوویستیە (مرۆڤایەتیەکانی) کە لەئاژەڵ جویێ دەکرێتـەوە پێـی، وەك: عەقیدەیەکی خواویستی و، سەربەستی هەڵبژاردن، وسەربەسـتی ڕادەربـڕین، هەروەها سەربەستی دەربـڕینی ڕای خـۆی بەرامبـەر (ئەنـدامێتی خـۆی) کـە بـە گەورەترین سیفەتی (مرۆڤایەتی) دەژمێررێت، ئەو ئەندامێتییەی لە تاك خاوەنێتی (الملکیة الفردیة) دا دەردەکەوێ. هەروەها سەربەستی دەربڕینی ڕای خۆی بەرامبەر جۆری کارو پسپۆری تێیـدا و، دەربـڕینی ڕای هونـەری خـۆیی - (زاتـی).. هـەتا ئاخرشت، کە (مرۆڤ) لە (ئاژەڵ) یان لە (ئامێر) جیادەکاتەوە! چونکە بیرو هۆش و باوەڕی کۆمۆنیست (شیوعی) وڕژێمی کۆمۆنیست (شیوعی) وەکو یەکن. کە مرۆڤ لەژێر سایەیاندا زۆر زۆر دێتە خوارەوە بۆ پلەی ئامێر!

کۆمەڵگەی بت پەرستی - کـە هـەتا ئێـستاش لەهندسـتان ویابـان وفلیـپین و ئەفریقادا هەرهەن - ئەم کۆمەڵگایانەش جاهیلین... چونکە: یەکـەم: بیروباوەڕیـان لەسەر ئەوە دادەمەزرێت کەغەیری خوا (الله) خوایانە، چ بڕیاری ئـەوە بـدەن، کـە لەگەڵ خوادا یەکێکی تر هەیە مافی خوایـەتی هـەبێت، چ لـەو کـەمتر دانرابێـت. دووەم: سیستم ویاسای حوکمی خۆی هەیە، کە غەیری خواویستین.جا ئەم سیستم و یاسایانە چ لەپەرستگاو کاهین وسـەدەنەو ئەفـسانەگەرو سـیحربازو پیرەکانیانـەوە وەرگرتبێـت، چ لەدەسـتە بـێ دینـە (عـەلمانی) یەکانییەکانـەوە، کـە دەسـەڵاتی یاسادانانیان هەیە، کە لەشـەریعەتی خواییـەوە وەرینـاگرن... واتـە حـاکمێتی و دەسەڵاتی باڵایان هەیە، کە بەناوی (گەل) یان بەناوی (حزب) یان بەهـەر نـاوێکی ترەوە بێ، کە حوکم دەکەن، ئەمەش جاهیلیەتە، چونکە حاکمێتی باڵا بۆ خوا نەبێ

بۆ هیچ کەسێکی تر، یان شتێکی تر نییە. ئەم حاکمێتییەش بەو ڕێگایـە دەبێـت، کە پێغەمبەرﷺ ڕای گەیاندوەو بەهیچ شێوەیەکی تر نابێت.

هەروەها هەموو کۆمەڵگەیەکی مەسیحی و جولەکەش، کە لەسەرزەمیندا هەن هەر جاهیلین، چونکە: یەکەم: لەعەقیدەو باوەڕی ڕاستی لایان داوە، چونکە خوایەتی خوای گەورە بە تاك دانانێن، بەڵکو هاوەڵی بۆ پەیدادەکەن، لەیەکێك لە شێوەکانی هاوەڵ بۆ خوا پەیداکردن (الشرك)دا. جا ئایا بە بڕیاردانی ئەوەبێت، کە خوا کوڕی هەیە، یان بە باوەڕ بە سێ پیرۆزەکە (الثالوث الأقدس) وەك لە مەسیحیدا هەیە، یان بەوەی، کە بەڕاستی دەرك بەخوا ناکەن، یان پەیوەندی نێوان بەندەو خوا لەسەر بناغەیەکی غەیری حەقیقەتی خۆی دەناسن وبڕیاری لەسەر دەدەن. ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ عُزَيْرٌ ٱبْنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَـٰرَى ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ ٱللَّهِ ۖ ذَٰلِكَ قَوْلُهُم بِأَفْوَٰهِهِمْ ۖ يُضَـٰهِـُٔونَ قَوْلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَبْلُ ۚ قَـٰتَلَهُمُ ٱللَّهُ ۚ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴾ التوبة /٣٠ واتە: جوولەکەکان ووتیان عوزێر کوڕی خوایە، مەسیحییەکانیش ووتیان: مەسیح(عیسا) کوڕی خوایە، ئەمە قسەی سەردەمیان بوو، هەر قسەی ئەوانەی پێشوویانەو دەیڵێنەوە، ئەوانەی کافربون، هەی خوا بیانکوژێت بزانە چۆن لەحەق لادەدەن!

﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾المائدة/٧٣ واتە: ئەوانەی ووتیان خوا سێیەمین کەسە، کوفریان کرد، یەك خوا نەبێت هیچ خوایەکی تر نییە، ئەوانە ئەگەر کۆتایی بەوە نەهێنن، کە دەیڵێن ئازارێکی زۆر کاریگەرو بە ژان کافرەکانیان دەگرێتە خۆ.

﴿وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ﴾المائدة/٦٤واتە: جولەکەکان ووتیان دەستی خوا داخراوە، هەی دەستیان برزێت، مادام وایان ووت ئەوا لەرەحمەتی خوا دورخرانەوە، خۆ هەردوو دەستی خوا کراوەن و هەر چۆنێك حەزبکات دەبەخشێت ..

هەروەها بۆیە کۆمەڵگەی مەسیحی و جولەکە بە کۆمەڵگەی جاهیلی دادەنرێن، چونکە دروشمی پەرستن وهەڵس وکەوتیان لەبیروهۆشێکی عەقیدەیی گومڕاو لەرێ لادراوەوە، وەرگیراوە...

هەروەها شەریعەت وسیستمەکەشیان لەسەر (خواپەرستی) دانەمەزراوە، چونکە مافی حاکمێتیان تایبەت بەخوا نەکردووەو، دەسەڵاتەکەی خۆشیان لە شەریعەتەکەی خواوە وەرنەگرتووە. بەڵکو کۆمەڵی مرۆڤیان داناوە، کە مافی حاکمێتی باڵایان داونەتە دەست، ئەوەش خوا نەبێت هیچ کەس مافی ئەوەی نییە... هەر لە کۆنەوە، خوای گەورە بەکافر ناوی بردوون، چونکە ئەو مافەیان دابوە دەست حیبروراهیبەکانیان (پیاوانی دینی جولەکەو مەسیحی) کە ئەوانیش بە ئارەزوی خۆیان یاساو شەریعەتیان بۆ دادەنان وخەڵکەکەش لێیان وەردەگرتن.

﴿ ٱتَّخَذُوٓا۟ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓا۟ إِلَّا لِيَعْبُدُوٓا۟ إِلَـٰهًا وَٰحِدًا ۖ لَّآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴾ التوبة /٣١ واتە: حیبرو ڕاهیبەکانی خۆیان کردبوون بەخوا،لە جێی خوا دایاننابوون ـ هەروەها مەسیح (عیسا)ی کوڕی مەریەمیش، هەروا ئەگەر چی ئەمان وافەرمانیان پێدرابوو، کە تەنها یەك خوا بپەرستن، کە هیچ خوایەك نییە جگە لەو. بێ خەوشی و پاکی بۆ خوا، لەوەی ئەوان ئاوا هاوەڵ بۆ خوا پەیدادەکەن!

ئەوان وەنەبێت حیبرو ڕاهیبەکانیان بە خوا زانیبێت و، دروشمی پەرستنەکانیان بۆ ئەنجام دابن، بەڵکو تەنها دانیان بەوە دانابوو، کە ئەوانە مافی حاکمێتیان هەیە. بەوەی هەرچی یاسایەك، کە ئەوان بۆیان دادەنان وەریان دەگرت، یاسای وا، کە خوا پێی ڕازی نییە. لەبەر ئەوە زۆر لەجێی خۆیدایەتی، کە هەر بەکافر دابنرێن. ئەم مافەشیان داناوە بۆ چەند کەسانێك، کە نەحیبرن ونەراهیبشن... هەموویان هەر وەکو یەکن...

لە کۆتاییدا دێینە سەر ئەو کۆمەڵگانەی خۆیان وا حاڵی دەکەن، کە (موسوڵمانن) ئەم کۆمەڵگانەش، کە بەجاهیلی دادەنرێن، لەبەر ئەوە نییە وا بزانن یەکێکی تر هەیە ودەبێت لەگەڵ خوای گەورە وەك خوا دابنرێت، یان لەبەر ئەوە نییە، کە دروشمی پەرستنەکانیان بۆ غەیری خوا بکەن، بەڵکو لەبەر ئەوە بە کۆمەڵگەی جاهیلی دادەنرێن، چونکە پەرستنەکانیان بە تەنها بۆ خوا نییە. ئەمەش بە ئاسانی لە ژیانیاندا دەردەکەوێ. چونکە ئەو کۆمەڵگانە ئەگەرچی باوەڕیشیان بەتەنها خوایەتی خوا هەیە، بەڵام گەورەترین وگرنگترین سیفەتی خوایەتییان داوەتە دەست غەیری خوا، کە حاکمێتییە... ئەویش بەوەیە کە ڕێگا دەدات غەیری خوا، سیستەم وشەریعەت ویاساو ڕێسای ژین وخوڕەوشت ونەریت و هەموو بنەماکانی تری ژیانیان بۆ دابڕێژێت... خوای گەورەش دەربارەی ئەم کۆمەڵگایانە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴾ المائدة / ٤٤ واتە: هەر کەسێك حوکم بەوە نەکات کەلەلایەن خواوە نێراوەتە خوارەوە ـ کەقورئانە ـ ئەوانە کافرن.

دەربارەی ئەوانەش، کە حوکم بە یاساکانی ئەوان دەکەن دەفەرموێت : ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ

﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓاْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِۦ﴾تا دەگاتە﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾النساء/٦٠–٦٥ واتە: ئەوانە نابینی کەخۆیان وا حاڵی کردووە، کە گوایە باوەڕیان بەوە هێناوە، کە بۆ تۆو بەوەی لەپێش تۆدا هاتۆتە خوارەوە. کەچی دەیانەوێت داوەری خۆیان ببەنە لای طاغوت (هەموو ڕژێم وکەسێکی خوا نەویستە) ئەگەرچی فەرمانیشیان پێدراوە، کە تاغوت بە کافر دابنێن و شوێنی نەکەون... پاشان دەفەرموێ: سوێند بێ بە خواکەی تۆ، باوەڕیان نییە، تا وەکو تۆ نەکەن بەحاکم لەو کێشانەی لە نێوانیاندا ڕوودەدات. جا ئەو کاتەی کە حوکمت کردن هیچ گرێیەك لە دڵیاندا نامێنێت، ئەوجا بە موسوڵمان حسابن، چونکە بەتەواوی خۆ تەسلیم دەکەن.

هەروەها لەوەو پێش خوا باسی جولەکەو مەسیحی کرد، کە کافرن و هاوەڵیان بۆ خوا بڕیارداوە و لەڕێبازی خواپەرستی لایان داوە، وەحیبرو ڕاهیبەکانیان کردووە بە خوا. چونکە ئەو دەسەڵاتەی بۆ خوایە داویانەتە حیبرو ڕاهیبەکانیان ئەمانەش، کە خۆیان ناوناوە (موسوڵمان) ئەو ماف و دەسەڵاتەیان داوە بە مرۆڤی وەکو خۆیان! خوای گەورە ئەمەی بە هاوەڵ پەیداکردن ــ شرك ـ لەسەر جولەکەو مەسیحی تۆمار کرد، چونکە وەك ئەوەی حساب، کرد کە ئەوانە عیسای کوڕی مەریەم بەخوا دادەنێنن و سیفاتی خوایەتی پێ دەبەخشن و، دەیپەرستن... ئەمەش لادانە لە ڕێبازی خوا بەیەکناسین وپەرستنی خوای تاك وتەنها، هەروەها ئەمە چوونە دەرەوەیە لە دینەکەی خواو لە ڕێبازی(لا اله الا الله)کە .

هەندێك لەم کۆمەڵگایانە بەئاشکرا (بێ دینی - عەلمانی) دەردەبڕن، ئەوەش ڕون دەکەنەوە، کە بە هیچ جۆرێك پەیوەندیان لەگەڵ دیندا نییە... هەندێکی تریشیان وا دەردەبڕن، کە گوایە (ڕێزی دین دەگرن)، بەڵام دین لە سیستمە

کۆمەڵایەتییەکەیان دەکەنە دەرەوە ودەڵێن ئێمە ئینکاری (نادیار) دەکەین وبەس! گوایە سیستمەکەیان لەسەر بناغەی بێ دینی (عەلمانی) دادەڕێژن.... ئەو ئینکاری کردنەی نادیاریش، لەبەر ئەوەیە، کە زانست پێچەوانەی شتی نادیارە! ئەمەش پاڵنتەیەکی نەفامانەیەو، نەزانەکان نەبێ کەس نایڵێت١. هەندێکی تریشیان حاکمێتی خوای گەورە بۆ خۆیان زەوت دەکەن و خۆیان چۆن حەز بکەن یاسا وا بۆخۆیان دادەنێن! پاشان دەڵێن ئەمە شەریعەتی خوایە! بەڵام ئەمانە هەموویان لەوەدا چوون یەکن، کە پەرستنەکانیان بۆ خوا نییە. ..

کۆمەڵگەی ئیسلامی دان بە ئیسلامەتی هیچ یەکێك لەم کۆمەڵگایانە ناهێنێ، کە هەن وهیچ ئیعتبارێکیان بۆ دانانێت .

ئیسلام تەماشای ئەو لافیتەو دروشم ونیشانانە ناکات، کە ئەم کۆمەڵگایانە ـ هەر چەند لەناو خۆدا لێك جیاوازبن ـ بەرزی دەکەنەوە.... چونکە هەمویان لەیەك حەقیقەتدا یەك دەگرنەوە.... ئەویش ئەوەیە کە ژیانیان لەسەر پەرستنێکی تەواوی یەکخواناسین دانامەزرێت... هەروەها ئەو کۆمەڵگانەش، کە خۆیان ناوناوە موسوڵمان، لەگەڵ کۆمەڵگەکانی تردا، لەیەك جێیەکدا یەك دەگرنەوە، کە ئەویش بەشداربونیانە لە سیفەتی (جاهیلێتی).

ئەمەش دەمان باتەوە بۆلای کۆتا کێشەمان، کە بریتییە لە چۆنێتی بەرنامەی ئیسلامی بەرامبەر هەموو واقیعێکی مرۆڤ.... ئەمڕۆو سبەی.... تا ئاخر زەمان.... ئەوەی لەبەندی یەکەمی بەشی (سروشتی کۆمەڵگەی موسوڵمان)دا بڕیارمان دا، کە ووتمان ئەو سروشتە لەسەر (خواپەرستی) دامەزراوە، لێرەدا سودی لێ وەردەگرین. ..

---

١ ـ بڕوانە: بەشی حەوتەم لە في ظلال القرآن / تفسیری ئەو ئایەتەی خوا دەفەرموێ: (وعنده مفاتیح الغیب لایعلمها الاهو).

دیاریکردنی چۆنێتی ئەو سروشتە، وەڵامێکی کت ومتی ئەو پرسیارەمان دەداتەوە، کە دەڵێ: ئەو بناغەیە چییە، کە ژیانی مرۆڤایەتی لەسەر دادەمەزرێت؟ ئەو سەرچاوەیە چییە، کە دەبێت بۆ لێ وەرگرتن لێی دیاری بکرێت وبشگەڕێینەوە سەری؟ ئایا ئەو سەرچاوەیە هەر دینەکەی خوایە، کە وەك بەرنامە بۆ ژیان دانراوە، یان ئەو واقیعەیە، کە مرۆڤی تێدادەژی، ئیدی هەر چۆنێك بێت ؟

لێرەدا ئیسلام ـ بێ چەندوچون و منجەمنج کردن ـ بەئاشکرایی وەڵامان دەداتەوە:

ئەو سەرچاوەیەی، کە دەبێت ژیانی مرۆڤایەتی ـ لە هەموو کاروبارێکیدا ـ بگەڕێتەوە سەری، بریتییە لە دینەکەی خوا، کە بۆ ژیانی داناوە.... بریتییە لە بڕیاردانی (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) کە یەکەمین ڕوکنی ئیسلامەتییە، تا ئەو سەرچاوەیەش دان بەو بڕیاری (لا اله الا الله ومحمد رسول الله) یە نەهێنێ، ناکرێ بچەسپێ و بێتە دی.... چونکە (خواپەرستی) وشێوەی وەرگرتنی ئەو پەرستنە لەو ڕێگایەوە نەبێ، کە پێغەمبەر ﷺڕای گەیاندووە، ناکرێ کۆمەڵگەی موسوڵمان بهێنێتە دی.... پاشان ئیسلام دەفەرموی:

﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ﴾ الحشر/ ٧ واتە: پێغەمبەرﷺ چیتان پێڕادەگەێنێ و پێی ڕازییە، وەری بگرن، بەرهەڵستی چیشی لێ کردن وازی لێ بهێنن.

پاشان ئیسلام دەپرسێت: ﴿قُلْ ءَأَنتُمْ أَعْلَمُ أَمِ ٱللَّهُ ﴾ ؟ البقرة /١٤٠ واتە: چما ئێوە زیاتر دەزانن، یان خوا، هەر خۆشی وەلام دەداتەوە: ﴿وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴾ البقرة / ٢١٦ واتە: خوا دەزانێت و ئێوە نازانن .چونکە ﴿وَمَآ

أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴾ الاسراء / ٨٥. واتە: ئێوە لە زانست شتێکی کەم نەبێت هیچتان نەدراوەتیٚ .

ئەو کەسەی کە زانایە ـ ئەوەیە، کە بونەوەرو مرۆڤی دروست کردووە و ڕۆزی دەرە، هەر ئەویشە، کە حوکم دەکات، دەبێت هەر دینەکەی ئەو بەرنامەی ژیان بێت وببێتە سەرچاوەی ژیان... چونکە ئەنجامی بیروهۆش وئایدیۆلۆژی و بۆچونی مرۆڤ خراپەکاری و بەدبەختی و لەڕاستی لادانە، چونکە هەمووی لەسەر بناغەی زانستی مرۆڤ دادەمەزرێن، کە هیچ نازانێت، ئەو مرۆڤەی شتێکی کەم نەبێت لە زانستی هیچی نەدراوەتیٚ!

دینەکەی خواش وەنەبیٚ ئالۆز بێت، بەرنامەکەشی کە بۆ ژیانی داناوە، وەنەبێت ڕون وئاشکرا نەبێت، بەڵکو بەشی دووەمی شایەتمان، کە (محمد رسول الله)یە دیاری کراوە، لەوەدا کە پێغەمبەرﷺ بە ووتارو ڕەفتار، خۆی دەقەکانی دیاری کردووە.... لە هەرچی کاتێکدا دەق هەبوو، ئەوە حوکمەو ڕادەپەڕێنرێت. چونکە ئیجتهاد لەدەقدا ناکرێت. ئەگەر دەق نەبوو (چ دەقی قورئان بێت چ هی حەدیس) ئەو کاتە بەپێی ئەو ئەسڵانەی لە بەرنامەکەی خوادا دیاری کراون، ئیجتهاد دەکرێت، نەك بەپێی هەواو هەوەس و ئارەزوی مرۆڤ:﴿فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ ﴾ النساء/٥٩ واتە: ئەگەر ناکۆکیتان لە شتێکدا بۆ دروست بوو، بگەڕێنەوە سەر فەرمایشتی خواو پێغەمبەرەکەیﷺ.

سنوری ئەسڵەکانی ئیجتهادو شێوەی وەرگرتن لە قورئان وحەدیس، دیاری کراون وبڕیاریان لەسەر دراوە، ئەوانیش وە نەبێت ئالۆز بن، یان ئاشکرا نەبن.

کەس بۆی نییە لە خۆیەوە یاسا دەرکات وبڵێ: ئەمە شەریعەتی خوایە. مەگەر لەو کاتەدا، کە حاکمێتی باڵا لە پەرستنی خواوە هەڵ هێنجراوە وفەرمانە

موسوڵمان عەقیدەو بیروباوەڕو بەهای لە خەڵکییەوە وەرنەگرتووە، تا هەوڵ بدات ڕێزی خەڵکی دەست بکەوێ، بەڵکو لە خوای خەڵکییەوە وەری گرتووە، کە ئەمەشی بەسە موسوڵمان ئەمانەی لە ئارەزوو هەواو هەوەسی خەڵکییەوە، وەرنەگرتووە، تا لەگەڵ ئارەزوو هەواو هەوەسی ئەواندا، بەرزو نزم ولارو وێر بێت، موسوڵمان ئەمانەی لەم جیهانە دیاری کراوەوە وەرنەگرتووە، ئیتر چۆن ئەو موسوڵمانە لە دەروونیدا هەست بە کزی دەکات، یان لە دڵی خۆیدا خەفەت دەخوا، کە ئەو پەیوەندە بە خوای خەڵك وتەرازوی ڕاستپەروەری و سەرچاوەکانی بوون هەڵدەسەنگێنێ و، نرخی دەداتێ، ئیتر پێوەرو بەهاو مەدح وسەنای خەڵکی چییە؟!

موسوڵمان لەسەر حەقە... لە حەقیش بترازێ گومڕاییە... با ئەو گومڕاییەش دەسەڵاتی هەبێ، بارازاوەو ڕواڵەتی بریسکەداریشی هەبێت، با کۆمەڵەو جەماوەریشی هەبێ... ئەمانە هیچیان هیچ لە حەق ناگۆڕن... مادام ئەم موسوڵمانەو لەسەر حەقە، ئیتر هەرچی لە حەق بترازێت گومڕایی و سەرگەردانییە.

موسوڵمانیش ـ کە باوەڕی بە خوا هەیە ـ ناکرێ گومڕایی و سەرگەردانی هەڵبژێری و حەق بخاتە لاوە. نابێ هیچ کاتێك حەق بە گومڕایی بگۆڕێتەوە، هەرچەند گومڕایی ڕواڵەتی جۆراوجۆری هەبێ و ئالاوالا بنوێنێ و، ئەمیش باروزروفی نا هەمواری یەك بە دووی یەکدا بێن! ﴿ رَبَّنَا لَا تُزِغْ قُلُوبَنَا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتَنَا وَهَبْ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنتَ الْوَهَّابُ ۝٨ رَبَّنَا إِنَّكَ جَامِعُ النَّاسِ لِيَوْمٍ لَّا رَيْبَ فِيهِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُخْلِفُ الْمِيعَادَ ﴾آل عمران/ ٨ ـ ٩ واتە: خوایە دوای ئەوەی ڕێنماییت کردین دڵمان لەسەر ڕێبازی ڕاستیی سارد مەکەرەوە، ڕەحمەت و بەزەیی خۆتمان پێ ببەخشە، چونکە بە ڕاستی تۆ بەخشندەییت، خوایە تۆ هەموو خەڵکی لە ڕۆژێکدا کۆ دەکەیتەوە، کە گومان لە هاتن و حەقیقەتیدا نییە، خوای گەورە بەڵێن ناشکێنێت.

بەم شێوەیە ئەوەی ویستمان بیخەینە پێش چاو لە مامۆستا سەییدی ڕەحمەتییەوە، وەرمان گرت. ئەگەرچی زۆریش بوو، بەڵام قەیدی نییە، چونکە پێویست بوو، چونکە بزوتنەوەکانی ئەم سەردەمەی ئێستامان زیاتر پێویستیان بە زانینی ناوەڕۆکی شایەتمان هەیە .

زاناکانمان ـ وەك چۆن زۆر کتێبیان دەربارەی باوەڕو لقەکانی باوەڕ نوسیوە، کە هەموویان هەر دەربارەی شوێنەوارو ئاسەواری شایەتمانن ـ هەر بەو شێوەیەش زۆریان کتێب لەسەر بەرهەم و کارتێکردنی شایەتمان نوسیوە. بگرە هەرچییان دەربارەی خوا بەیەکناسی و شەرع و سۆفیگەری نوسیوە لە ڕاستیدا هەر بریتی بوە لەلێکدانەوەو ڕاڤە کردنی وشەکانی شایەتمان و، کاریگەرییان لەسەر دڵ و دەروون و پارسەنگ پەروەردەکردنی موسوڵمان. مرۆڤیش تا بە تەواوی شارەزای هەموو دەقەکانی قورئان و حەدیس نەبێت و بە تەواوی لێیان حاڵی نەبێت و نەزانێت ئەم ئەحکامانە چۆن لەو دەقانەوە وەرگیراون، نازانێت شوێنەوارو کارتێکردنی ناوەڕۆکی شایەتمانەکە چییەو چەندە؟! ئەوەندەی هێناشمانەوە لەسەر ئەم باسە، بەسە بۆ هەر کەسێك سەرنجی دا بێت، کە هەر خاڵێکمان لە لایەنێکی کاریگەری شایەتمانەکەوە وەرگرتوە..

# بەشی سێیەم

## چی پێچەوانەی شایەتمانە

زۆر کەس لەوەدا بە هەڵەدا دەچن، کە گوایە هەر کەس شایەتمانی هێنا، یان ناوو نازناوو لەقەبێکی ئیسلامی لە خۆی نا، ئیتر بە هیچ شێوەیەك لە ئیسلام ناچێتە دەرەوە!! بەڵام هەڵەنگوتن و سەرسم دانە!! چونکە زۆر شت هەیە، ئەگەر موسوڵمانێك بیان کات، یان بیانڵێ، پێی لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە، بەو دەربڕینەی، کە پێچەوانەی شایەتمان ڕەفتاری نواندوە... بۆیە شارەزا بوون لەم باسە زۆر پێویستە، زۆر جار و زۆر موسوڵمان هەن، یان بە نەزانی، یان بە گێلێتی ئاسان دەکەونە ناو کوفرەوەو هەر واش نازانن، کە گوناحێکیان کرد بێت!! یان موسوڵمانی وا هەیە کابرایەکی مورتەد دەکاتە سەرپەرشتیاری خۆی و واش نازانێت، کە پێچەوانەی شایەتمانەکەی جوڵاوەتەوە، یان وا دەزانێ کافر بونی ئەو، زیان بە ئاین ودینداری ئەم ناگەیێنێت! ئەمەش وا نییە... لەبەر ئەوە وا هەندێك لەو هەڵوێستانە دێنینەوە، کە پێچەوانەی شایەتمانن، گەرچی ناتوانین ـ بێ گومان ـ لێرەدا هەموو هەڵوێستێك و هەم بە بەڵگەوە باس بکەین، ئەوە کتێبی تایبەتی خۆی هەیە، بەڵام ئەوەی، کە بە پێویستی دەزانین و وا هەست دەکەین زۆر موسوڵمان لێیان بێ ئاگا بون، ئەوانە باس دەکەین:

١ـ پشت بە غەیری خوا بەستن: واتە ئیعتیماد کردنە سەر غەیری خوای پەروەردگار، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾ المائدة/٢٣ واتە: پشت بە خوا ببەستن، ئەگەر ڕاست دەکەن و

موسوڵمانن... لەمەوە ئەوە ڕون دەبێتەوە، کە مادام موسوڵمانین بۆمان نییە پشت بە غەیری خوا ببەستین. یان: ﴿وَضَاقَتْ عَلَيْكُمُ الأَرْضُ بِمَا رَحُبَتْ ثُمَّ وَلَّيْتُم مُّدْبِرِينَ﴾ التوبة/٢٥ واتە: ڕۆژی حونەین، کە زۆری ژمارەی خۆتان سەرسام و هەڕاڵی کردن [١] کەچی هیچ سوودێکی نەبوو بۆتان! ئەو سەر زەمینە پان و پۆڕەتان لێ هاتەوە یەك و سەری دنیاتان لێ هاتەوە یەك!

ئەمە لە ناوەڕۆکی (لا الە الا الله) دا دەردەکەوێت، چونکە وەکو دیمان ئاسودەیی و هێمنی لە کەناری پشت بە خوا بەستن و یاد کردنی ئەودا دەست دەکەوێت...

پشت بە خوا بەستن، مانای پشتێن کردنەوەو واز لە کار کردن نییە بەو بەهانەی پشت بە خوا بەستراوە!! نا، چونکە خوای گەورە دوو فەرمانی بە ئێمەی موسوڵمان کردوە: فەرمانی پێداوین، کە کار بکەین، فەرمانیشی پێداوین، کە پشت بە کارەکەی خۆمان نەبەستین... فەرمانی پێداوین کاسبی بکەین، فەرمانیشی پێداوین، کە باوەڕمان بە وە هەبێت، کە تەنها خوا ڕزق و ڕۆزیدەرە... فەرمانی پێداوین، کە ئامێرو تفاقی شەڕ ئامادە کەین، بەڵام فەرمانیشی پێداوین، کە یقینمان هەبێت، کە سەرکەوتن هەر لە لایەن خواوەیەو ئەو دەیبەخشێت... فەرمانی پێداوین، دەرمان بۆ چارەسەری نەخۆشیەکانمان بەکار بهێنین، فەرمانیشی پێداوین، کە بیرو ئیعتیقادمان وا نەبێت، کە دەرمانەکە بۆ خۆی چاکمان دەکاتەوە! فەرمانی پێداوین، کە هەموو هۆیەك بۆ سەرکەوتنی کارەکانمان بگرینە بەر، فەرمانیشی پێداوین، کە ئیعتماد بکەینە سەر خوای گەورە لە وەدەست

---

١- ژمارەیان دوازدە هەزار کەس بوو بۆیە پێیان دەفەرموێ: موعجیب بوون بە زۆری ژمارەی جەنگاوەرەکانتان ..(و).

هێنانی سەرکەوتندا... جا هەر کەسێك هەموو هۆکاری ئەنجامدانی کارێکی ئامادە کرد، بەڵام لە کارەکەیدا پشتی بە خوا نەبەست، ئەوە یەکێك لە فەرمانەکانی شکاندوە. هەر کەسێکیش پشتی بە خوا بەست بێ ئەوەی هۆکارەکانی ئەنجامدان و سەرکەوتنی کارەکەی ئامادە بکات، ئەوە ئەویش فەرمانێکی بەجێ نەهێناوەو، کە فەرمانی دوەمە ..

جیاوازی نێوان کافر و موسوڵمان لێرەدا دەردەکەوێت، کافر هەموو تواناو ڕەنجێکی دەخاتە گەڕ، موسوڵمانیش وەکو ئەو هەموو تواناو ڕەنجێکی دەخاتەگەڕ، بەڵام کافرەکە ئیعتیماد دەکاتە سەر ڕەنجەکەی خۆی، موسوڵمانەکەش ئیعتیماد دەکاتە سەر خوای خاوەنی.

کەوا بوو پشت بەستن بە هۆ و لە خوا غافڵ بون گوناحە، باوەڕ بون بەوەی، کە هۆکار بەسە بۆ سەرکەوتن و، ئەمە پەیوەندی بە پشت بە خوا بەستنەوە نییە: شیرکە... پێچەوانەی شایەتمانەکەیە، چونکە بە درۆ خستنەوەی دەیان ئایەتی قورئانە، کە لە هەموویاندا زانست و تواناو ویستی خوا دەردەکەوێت، وەك: ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ الانفال/١٧ واتە: تیرەکە تۆ نەتدەهاویشت، کە دەتهاوێشت، خوا بوو دەیهاویشت. یان ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾الانفال/١٠ سەرکەوتن تەنها لە لایەن خواوەیە. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ﴾ الذاريات/٥٨ تەنها خوا ڕۆزی دەرەو هەر ئەویش خاوەن هێزی کاریگەرە. ﴿وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ﴾ الشعراء/٨٠، کە نەخۆشیش کەوتم ئەو چاکم دەکاتەوە ؟ ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً﴾ الحج/٦٣ نابینیت خوا لە ئاسمانەوە ئاوی ناردۆتە خوارەوە ؟!

کەوا بوو دەبێت باوەڕمان بەو هۆکارانە هەبێت، کە خوا لەم گەردونەدا دایناون، دەبێت باوەڕمان بەوە هەبێت، کە تەنها خوای گەورە کردگارو بکەری هەموو شتێکە:﴿اَللَّهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾الزمر/٦٢خوا کردگاری هەمو شتێکە. ئەو کەسەی ئینکاری هۆکان بکات و نرخیان نەداتێ؛ کوفری کردوە، ئەوی هەمو نرخ و بەهایەك بە هۆکارەکان دەدات و بەس؛ ئەوە هاوەڵی بۆ خوا پەیدا کردوە...

٢ـ دان بەوە دا نەنان، کە هەرچی نازو نیعمەتێك هەیە، ئەوی دیارەو ئەوی پەنهانە، زۆرە یان کەم، هەست پێکراوە یان هەست پێنەکراو، هەموی هەر لە خواوەن، ئەگەر فەزڵی خوا نەبێت ئەمانەش نابن... لە لێکۆڵینەوەی (لا الە الا اللە) کەدا ئەوەمان تێبینی کرد، کە تەنها خوای پەروەردگار نیعمەت بەخشە.. ئەم مانایە بەوە زیاتر دەچەسپێت، کە دان بنێین بەوەدا، کە هەرچی توشمان دێت لە خواوەیە ، تەنها ئەو پێمان دەبەخشێت و ئەویش وەریدەگرێتەوە، مافی خۆشیەتی لە بەخشین و وەرگرتنەوەیدا، ئەو ئێمەی پێ تاقی دەکاتەوە: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعْمَتَ اللّهِ لاَ تُحْصُوهَا إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّارٌ﴾ ابراهیم/٣٤ واتە: ئەگەر نیعمەتەکانی خوا بژمێرن، بۆتان لە ژمارە نایەن، بەڵام مرۆڤ خۆی زۆر ستەم پیشەو کوفرانە بژێرە! ((أَلَمْ تَرَوْا أَنَّ اللَّهَ سَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الارْضِ وَأَسْبَغَ عَلَيْكُمْ نِعَمَهُ ظَاهِرَةً وَبَاطِنَةً وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ))لقمان/٢٠ واتە: ئایا نابینن خوا هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە بۆ ئێوەی ژێردەست کردوە، نیعمەتی دیارو نادیاری خۆی بەسەرتاندا ڕشتوە، کەسانی وا هەن، کە بێ ئەوەی دەربارەی خوای گەورە هیچ زانیاریەکیان هەبێت، کەوتونەتە موجادەلەو دەمەوەری!!

●﴿إِنَّ قَـٰرُونَ كَانَ مِن قَوْمِ مُوسَىٰ فَبَغَىٰ عَلَيْهِمْ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ مِنَ ٱلْكُنُوزِ مَآ إِنَّ مَفَاتِحَهُۥ لَتَنُوٓأُ بِٱلْعُصْبَةِ أُو۟لِى ٱلْقُوَّةِ إِذْ قَالَ لَهُۥ قَوْمُهُۥ لَا تَفْرَحْ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْفَرِحِينَ ﴿٧٦﴾ وَٱبْتَغِ فِيمَآ ءَاتَىٰكَ ٱللَّهُ ٱلدَّارَ ٱلْـَٔاخِرَةَ ۖ وَلَا تَنسَ نَصِيبَكَ مِنَ ٱلدُّنْيَا ۖ وَأَحْسِن كَمَآ أَحْسَنَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ وَلَا تَبْغِ ٱلْفَسَادَ فِى ٱلْأَرْضِ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٧٧﴾ قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍ عِندِىٓ ۚ أَوَلَمْ يَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ قَدْ أَهْلَكَ مِن قَبْلِهِۦ مِنَ ٱلْقُرُونِ مَنْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُ قُوَّةً وَأَكْثَرُ جَمْعًا ۚ وَلَا يُسْـَٔلُ عَن ذُنُوبِهِمُ ٱلْمُجْرِمُونَ﴾القصص/٧٦-٧٨ واتە: قارون لە قەومی موسا بوو، دەستدرێژی کردە سەر قەومەکەی خۆی، ئەوەندەمان ماڵ و سامان دابویە، کە کلیلی گەنجینەو قاسەکانی، کۆمەڵێکی زۆر بەخۆو بازو ئەستوور، بە زەحمەت بۆیان هەڵ نەدەگیرا!، پیاوماقوڵانی قەومەکەی پێیان دەووت: دڵ بە ماڵ و سامانت خۆش مەکە، پێی هەراڵ(مەغرور) مەبە خوا ئەو کەسانەی خۆش ناوێت، کە بە ماڵ و سامانی دنیاوە خۆ با دەدەن و مەغرور دەبن پێی، با مەبەستت لە بەکار هێنانی ئەوەی، کە خوا پێی داویت ڕۆژی قیامەت بێت، دنیاشت ئەوەندە لە هۆشدا بێت، کە لە بیرت نەچێتەوە! چاکەش بکە هەر وەکو، کە خوای گەورە چاکەی لەگەڵدا کردویت. خوا خراپەکاری خۆش ناوێت. ئەویش ووتی: ئەوەی دەستم کەوتوە ئازایەتی خۆمە، لە زانیاری و کارامەیی خۆمەوەیە! بۆچی نازانێت، کە خوای گەورە لە نەتەوەو قەومەکانی پێشوو کەسانی وای بە فەتارەت دا، کە زۆر لەم بەهێزترو خاوەن دەسەڵاتتر بون! خاوەن شوێن کەوتوی زۆرتریش بوون، ئێستا لە تاوانباران ناپرسرێتەوە چیان کرد (هەڵ دەگیرێت بۆ قیامەتیان)...

● هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُؤْمِنۢ بِٱللَّهِ يَهْدِ قَلْبَهُۥ﴾ التغابن/١١ هەر کەس باوەڕ بهێنێت، ڕێنمایی دڵی دەکرێت..

● ﴿فَإِذَا رَكِبُواْ فِى ٱلْفُلْكِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ فَلَمَّا نَجَّىٰهُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ﴾ العنكبوت/٦٥ واتە: کە سواری پاپۆڕو کەشتی دەریا دەبن، زۆر خواویستانەو لە ناخەوە لە خوا دەپاڕێنەوە و ڕوی تێدەکەن، کەچی، کە ڕزگاریشیان دەکات و بە سەلامەتی دەیانگەیێنێتە کەناری ئەمان، دیسان هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دەدەن!!

● ﴿فَإِذَا مَسَّ ٱلْإِنسَٰنَ ضُرٌّ دَعَانَا ثُمَّ إِذَا خَوَّلْنَٰهُ نِعْمَةً مِّنَّا قَالَ إِنَّمَآ أُوتِيتُهُۥ عَلَىٰ عِلْمٍۭ ۚ بَلْ هِىَ فِتْنَةٌ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٤٩﴾ قَدْ قَالَهَا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَمَآ أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٥٠﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ ۚ وَٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنْ هَٰٓؤُلَآءِ سَيُصِيبُهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا كَسَبُواْ وَمَا هُم بِمُعْجِزِينَ ﴿٥١﴾ أَوَلَمْ يَعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ الزمر٤٩ـ٥٢ واتە: مرۆڤ هەر، کە زیانێکی پێ دەگات هاناو هاوار بۆ ئێمە دێنێت! کەچی هەر بەوەندەی نیعمەتێکمان پێ بەخشی، دەڵێ: من بە هۆی زانیاری خۆمەوە ئەمەم دەست کەوتوە! نازانێت ئەوە ماددەی تاقی کردنەوەیەتی و خراوەتە بەردەستی، ئیتر هەر وایە زۆربەیان پەی بەوە نابەن و نازانن، زۆری تریش پێش ئەوان وای ووت، کەچی هەموو ئەوەی پەیدایان کرد دادێکی نەدان و کردەوە بەدو خراپەکانیان هاتەوە ڕێیان! هەروەها ئەو کەسانەشیان، کە ستەمیان دەکرد دەرئەنجامی کارە ناپەسەندەکانیان دێتەوە پێشیان و حەتمەن دەرەقەتی نایەنەوەو

ناشتوانن خۆی لێ بدزنەوە. مەگەر ئەوانە نازانن، کە خوای گەورە ڕۆزی و بەرەکەتی خۆی بەسەر ئەو کەسانەدا دەڕێژێت، کە خۆی دەیەوێن، لەو کەسانەشی دەگرێتەوە، کە نایەوێت پێیان ببەخشێت، ئەمانەش بەڵگەن بۆ کەسانێك، کە باوەڕ دەهێنن...

• ﴿لَّا يَسْـَٔمُ ٱلْإِنسَـٰنُ مِن دُعَآءِ ٱلْخَيْرِ وَإِن مَّسَّهُ ٱلشَّرُّ فَيَـُٔوسٌ قَنُوطٌ ﴿٤٩﴾ وَلَئِنْ أَذَقْنَـٰهُ رَحْمَةً مِّنَّا مِنۢ بَعْدِ ضَرَّآءَ مَسَّتْهُ لَيَقُولَنَّ هَـٰذَا لِى وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّجِعْتُ إِلَىٰ رَبِّىٓ إِنَّ لِى عِندَهُۥ لَلْحُسْنَىٰ ۚ فَلَنُنَبِّئَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِمَا عَمِلُوا۟ وَلَنُذِيقَنَّهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٠﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَـٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ فَذُو دُعَآءٍ عَرِيضٍ﴾ فُصِّلَتْ / ٤٩ـ٥٠ واتە: مرۆڤ لە پاڕانەوەو هانا بردن بۆ خوای گەورە وەڕس نابێت، کەچی، کە ناخۆشیەکی دێتە ڕێ ڕەش بین و هیوا بڕاو دەبێت! ئەگەر ڕەحمەتی خۆمانی بەسەردا بڕێژینەوە ـ دوای ئەوەی ، کە ناڕەحەتی و دەردەسەری هاتە ڕێ ـ لەسەر ئەوە دڵنیا دەبێ، کە ئەمە تازایەتی خۆیەتی و لە بلیمەتی خۆیەوەیە، کە توانیوێتی کێشەکانی چارەسەر کات! دەڵێ: من خۆم شایانی ئەوەم، بۆ قیامەتیشی دەڵێ: بڕوا ناکەم زیندو بونەوە هەبێت!! گەر گەڕانەوە بۆ لای خوا هەبێت و زیندو بکرێینەوە، لای ئەویش هەر چاکەو خێرم دەست دەکەوێت! بێ گومان ئەوانەی، کە بێ باوەڕ بون، ئێمە ئەوانەیان هەموو بە ڕودا دەدەینەوەو لە ژان و سزای سەختیان پێ دەچێژین. زۆر مرۆڤ هەن، کە نازو نیعمەتی پێ دەبەخشین پشت هەڵ دەکات و یاخی دەبێت، خۆی بە زل دێتە پێش چاوو دور لە خواویستی دەژی! هەر بەوەندەش دوچاری ناڕەحەتیەکیش دێت، بە کوڵ و دڵ دەکەوێتەوە ئاهو نزوڵەی پاڕانەوە!!

• ﴿ وَمَا بِكُم مِّن نِّعْمَةٍ فَمِنَ اللَّهِ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ الضُّرُّ فَإِلَيْهِ تَجْأَرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ الضُّرَّ عَنكُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنكُم بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾ النحل/٥٣ـ٥٤ واتە: هەرچی نیعمەتێکتان هەیە هەر لە خواوە بۆتان دیاری کراوە، کەچی هەر، کە ناڕەحەتی و پشێویەکتان دێتە ڕێ هاوارتان لێ هەڵ دەستێت و پەنا دەبەنەوە بەر خوا! هەر بەوەندەش، کە ناڕەحەتیەکەی لەسەر نەهێشتن، هەندێکتان دەکەونە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دان! چونکە دەیانەوێت بە کوفرانە بژێری، سپڵەیی خۆیان دەرخەن!! ڕابوێرن بە کەیفی خۆتان، دوایی دەزانن چیتان دێتەوە ڕێ.

• ﴿هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِي أَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ﴾ النمل/٤٠ ئەمە فەزڵ و بەخششی خوای گەورەی خۆمەو ویستی وایە تاقیم کاتەوە پێیان، کە ئایا شوکرانە بژێرم، یان کوفرانە بژێر؟

• ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا أَوَّلُ الْمُسْلِمِينَ ..﴾ الانعام/١٦٢ـ١٦٣ بڵێ: من نوێژو پەرستن و ژیان و مردنم، هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، کە بە هیچ شێوەیەك هاوەڵی نییە.

هەروەها ئەم حوکمە لەوەوە وەردەگرین، کە دەڵێین: (لا معبود بحق الا الله: هیچ پەرستراوێك نییە، کە بە حەقیقەت شایانی پەرستن بێت، جگە لە خوای گەورە) پەرستنیش هەر نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج نییە، بەڵکو هەموو کارێکە، کە لەبەر خاتری خوا ئەنجام دەدرێت، هەر کارێکیش لەبەر غەیری خوا گەورە بکرێت، شیرکەو هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنە... هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دان زۆر شێوازی هەیە :

ا ـ ئەگەر موسـولّمان نەتەوایـەتی کـردە ڕێبـازو ئامـانج و، هـەموو گوفتـارو کردارێکی بۆ هێنانە دی، ئامانجی نەتەوایەتی تەرخان کرد! وەك ئەوەی بۆ ڕێبازی نەتەوایەتی ببێتە سەربازو لە پێناوی ئامانجی، ئـەودا بجـەنگێت، یـان بانگـەوازی قەومی هەلگرێت و خەلّکی بۆ بانگهێشت بکات. یان ڕەگـەز پەرسـتی بنوێنێـت، ئەمانە هەموی شیرکن و هاوەلّ بۆ خوا پەیدا کردنن، چونکە خوای گەورە فەرمانی بەوە داوە، کە تەنها بەرنامەکەی ئەو بگێرێتە بەرو ڕێبـازی پێغەمبـەران بکرێتـە ڕێباز و خەبات و ڕەنجدان هەر بۆ سەرخستنی ئایینەکەی ئەو بـدرێت و، جـەنگیش بۆ بەرز کردنەوەی وشەی خواو لەبەر خاتری خوا بکرێت و بـەس... ئێمـە کاتێـك هەموو ئەمانە لەبەر خاتری خـوا ئـەنجام دەدەیـن، مانـای وایـە خزمـەتی گـەل و نەتەوەی خۆمانمان کردوە، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر لێ گـەڕێن خـەلّکانێکی کـافرو مورتەد گەل و نەتەوەی ئێمە بەرەو هەلّدێری کوفرو بێ دینی پەلکێش کەن، تا بـە کـافری دەژیـن و بـەکافری دەمـرن، مانـای وایـە دژی گـەل و نەتـەوەی خۆمـان وەستاوینەتەوەو، بەرژەوەندیەکانیمان خستۆتە دەست خەلّکێکی ئالّقە لـە گـوێ ی کوفرو بەکرێ گیراوی ئەملاولا... ئەمە جگە لـەوەی موسـولّمان بـە دیـدو بـون و بەرژەوەندی خۆی و نەتەوەکەیەوە، بە خـوا ویـستی و بەرنامـەی ئیـسلامەکەیەوە پەیوەستەو بەس، ڕەزامەنـدی خـوای گـەورە لەمەدایـە، نـەك لـە نەتەوەگـەرێتی جاهیلیی.

ب ـ کار کردن بۆ نیشتمان پەروەرێتی، ئەمیش هەر شیرکەو هاوەلّ پەیدا کردنە بۆ خوای پەروەردگار، چونکە موسولّمان بەو ئەندازەیەوە بە ولاّتێکەوە بەندە، کە خەلّکەکەی بە موسولّمانێتی ملکەچی ئایینی خوا بوبن و بەرنامەی ئەو ڕاپەڕێنن، ئەو کاتەش کار کردن بۆ خاك و نەتەوەو ولاّت کار کردن دەبێت بۆ خوا... ئەگەر ولاّت و نیشتمان بوو بە قیبلەو ڕوی هەموو کارێك لەو کراو نیەت لەبەر خاتری

خوا نەما، ئەوە هەر شیرکەکەیەو هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنەکەی جاهیلییە، خوای گەورە ڕەخنەو گازاندەی لە نەفامی و نەزانی ئەو کەسانە گرتووە، کە بە بەهانەی خۆبەستنەوەوە بە خاك و وولاتێکەوە فەرمانی خوایان فەرامۆش کرد! وەك دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ ۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾ النساء/٦٦ واتە: ئەگەر ئێمە لەسەر ئەو کەسانەی، کە حوکمی تاغووت ڕادەپەڕێنن فەرزمان بکردایە، کە نیشتمانەکەیان جێ بهێڵن و کۆچ بکەن، دەستەیەکی کەمیان نەبێت، کەسیان نەیاندەکرد! ئەگەر ئەو دووڕوانە ملکەچی و گوێ ڕایەڵی ئەو ڕێنماییانەی ئێمە ببونایە، کە ئامۆژگاریان پێ کرابوو، حەتمەن چاکتر بوو بۆیان و پتەوترو جێ پێ قایمتر دەبون.

نابێت بەرز کردنەوەی ئالآی نیشتمانی و پەروەردەی نیشتمانی ویەکێتی نیشتمانی و خەباتی نیشتمانیێ بکرێتە تەرازوو پارسەنگی کارو کردەوەو، جموجوڵی خەڵکی پێ بکێشرێت... ئەگەر کرا ئەوە شیرك ئەنجامدانە، ئەوە هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دانە... ئەمما ئەگەر باوەڕ هێنان بە خواو ڕاپەڕاندنی فەرمانی خوایی بووە تەرازو ومەحەکی پارسەنگی و کارو کردەوە و مەسەلەیەك هاتە پێش، کە خزمەتی ولآت و نیشتمان دەکات و دژایەتی لەگەڵ ئیسلامەکەدا ناکات، دەشێت هەوڵی بۆ بدەین، چونکە لەم کاتانەدا، نەك هەر قبوڵە، بەڵکو بە خواپەرستیش دادەنرێت...

ج ـ ئیش کردن لە پێناوی مرۆڤ و مرۆڤایەتی: ئەمەش شیرك و هاوەڵ بۆ خوا بڕیاردانە، چونکە دور خستنەوەی مرۆڤە لە خوا، کە دەبێت مرۆڤ هەمیشە ڕوی چاوو دڵی لەو بێت و ئەو بپەرستێت (بە مانا بەرفراوانەکەی پەرستن).

هەروەها دروشمی زانست بۆ زانست شیرکە...

دروشمی هونەر بۆ هونەر شیرکە ..

ئەدەب بۆ ئەدەب شیرکە...

هەروەها هەر دروشمێکی تر، کە مرۆڤ لـە خواویـستی دور بخاتـەوەو بەرنامـەو ئایینی خوای پێ بگۆڕێت...

٤ـ بڕیاری ڕەهای یاساو ڕێسا داڕشتن بدرێت بە هەر کەسـێك شـیرکە: چـونکە ئەمە مافی خوایەو بەس... هەر کەسێك ئەم مافـە (مـافی حـەڵاڵ کـردن و حـەرام کردن) بۆ خۆی زەوت کات، یان بە یەکێکی تری ببەخشێت، یان بۆ یـەکێکی تـری بە ڕەوا بزانێت، پێی کافر دەبێت، چـونکە خـوای پـەوەردگار دەفـەرموێ: ﴿أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ﴾ الاعراف/٥٤ خەڵق کردن و فەرمان دەرکردن هەر هی خوایەو بەس. ﴿إِنِ ٱلْحُكْمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾ الانعام/٥٧ حوکم تەنها حوکمی خوایەو بەس.

● ﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَـٰنَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ ﴾التوبە/٣١ حیبرو ڕاهیب (پیاوانی ئایینی دیان و جولەکە)ەکانی خۆیان کردبوو بە خواو لە جێی خوای پەروەردگار دایاننابون.

ئەم حوکمە ئەوەش دەگرێتەوە، کە پێی دەڵێن (دیموکراسی)، چونکە دیموکراسـی بریتییە لە سەرجەمی ڕای زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەن (پەرلەمان). ئاشکراشـە، کە ئەم ئەندامانەن، کە یاساو ڕێسا دادەڕێژن، هـیچ دەسـەڵاتێکی تـر ـ جگـە لـە دەسەڵاتی دەستور ـ لەسەرو دەسەڵاتی ئەمانەوە نییە، گەرچـی دەسـتوریش هـەر کەسانی تری وەکو ئـەمان، ئەنـدامی پەرلـەمانێکی پێـشوتر بـون و ئـەو یاسـاو ڕێسایانەیان داڕشتوە. کەوا بوو مادام هەر گەڕایەوە سەر بیرو ڕاو بۆچـونی هەنـدێ مرۆڤ، هەر شیرکەو هەر هاوەڵ بۆ خوا بڕیار دانە، چونکە مـافی بە حەڵاڵ دانان و بە

حەرام دانانی تێدا دراوەتـە دەسـت غـەیری خـوای پـەروەردگار... لـە ئیـسلامدا شێوەیەکی ڕاستتر و پەسەند هەیە، کە نەدەمانخاتە ناو گێژاوی شـیرکەوە، نـە بـیر جەمانیـشمان دەکـات، ئـەویش پێکهێنـانی ئەنجومـەنی ڕاوێـژکاری (مجلـس الشوری)اەیە، ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە بـە ڕێـسا شـەرعیەکانی خـوای گـەورەوە دەبەسترێنەوە، بۆیان نییە لە دەقەکانی قورئان و حەدیس لادەن، جا ئـیتر ئەمانـە بە ڕێگاکانی هەڵبژاردن هاتونەتە سەرەوە، یان بە تەعین، گرنگ ئەوەیە پابەندن بـە کۆمـەڵێك یاسـاو ڕێـساوە، کـە ئوممەتەکـەش پێـشتر زانیـوێتی چـین، ئـەمما لـەو مەسەلانەدا، کە دەقێکی قورئـان، یـان حەدیـسی سـەحیحی لەسـەر نییـە، یـان لەسەری هەیە، بەڵام مانای جیاوازو لێکدانەوەی هەمە جۆری هەیە، یان دەقەکە بە شێوەیەکی هێندە بنبڕ (قَطعي) نییە، تا لێی لانەدرێت، لەم حاڵەتانەدا ڕاوێـژکاران دەتوانن ئەو ڕایەی زۆرینەی بۆچونەکان دەگرێتە خـۆ، بیکەنـە یاسـاو خەڵکەکـەی پێوە پابەند کەن... کەوا بوو بەم ڕێگایە ئەوەمان سەلماند، کە دەستوری وڵات هەر قورئان و حەدیسەو هەر ئیسلامە، بەڵام لە هەمان کاتـدا سـودمان لـە نـەرمی و کشانی ڕێسا شەرعیەکان وەرگرت... ئەمما ئەنجومەنێك، یان سەرکردایەتی حیزبێك (وەك لە سەرمایەداریدا هەیە)، یان پێشڕەوانی چـینێك (وەك لـە سۆشیالیـستی و کۆمۆنیـستیدا هەیـە)، یـان تاکـە کەسـێك(دیکتـاتۆرێکی فیرعـەون ئاسـا) یـان کۆمەڵێك هەر بە ناوی دینەوە! خۆیان لەو خەڵکە بکەنە خواو، یاساو ڕێسایان بـۆ دارێژن و خەڵکەکە ناچار بکەن بڕیارەکانیان وەرگرن و جێبەجێی بکـەن، ئـەوە لـە ئیسلامدا جێی نابێتەوە، ئەوانەو ئەوانەش، کە بە حوکمیان ڕازین،حوکمی شیرك و کوفر و لەئایین هەڵگەڕانەوەیان بەسەردا دراوە.... ئەمە حـوکمی هـاوەڵ بـۆ خـوا پەیدا کردنـی هەیـە ئـەوەش دەگرێتـەوە، کـە کەسـێك دان بـەوەدا نـەنێت، کـە لێپرسراوە بەرامبەر هەموو فەرمانێکی خوایی، کە پێغەمبەرﷺپێی ڕاگەیاندوون،

چونکە پێویستی سەر شانی هەمو موسـولْمانێکە لێپرسـراوێتی پابەنـد بـوون بـە شەریعەتی خوای گەورەو ڕاپەڕاندنی لە دنیادا بخاتە ئەستۆی، چونکە لەو شەریعەتە ڕێدراوە بترازێت ئیتر هەواو هەوەسە، وەك خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ جَعَلْنَٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلْأَمْرِ فَٱتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ الجاثيـــــة/١٨ واتە: پاشان تۆمان خستە سەر بەرنامەو ڕێسای شەریعەتێك، دەتۆش شوێنی کەوەو شوێن هەواو هەوەسی ئەو کەسانە مەکەوە، کە نازانن...

٥ـ لەوانەی، کە پێچەوانەی شایەتمانە ئەوەیە کە: ملکەچی و گوێڕایەڵی خۆت بدەیتە دەست غەیری خوا، هەوەرها غەیری ئەوانەی خوای گەورە ڕێی داون، چونکە یەکێك لە ماناکانی( لا اله الا الله )ئەوەیە، کە ملکەچی و گوێڕایەڵی هیچ کەسێك بە ڕەهایی ناکرێت غەیری خوای پەروەردگار، مەگەر پێغەمبەرﷺ، کە خوای پەروەردگار ڕێی پێداوین و فەرمانی پێکردووین، کە وەلائی خۆمان بدەینە دەست ئەو زاتە، چونکە گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺهەر گوێڕایەڵی خوای گەوەرەیە وەك دەفەرموێ: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ النساء/٨٠ واتە: هەر کەس گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺ، بێت ئەوە گوێڕایەڵی خوای گەورە بوە... هەروەها دەشێت ئەو ملکەچی وگوێڕایەڵیە بدرێت بە پێشەواو کاربەدەستانی ئیسلام، بەو مەرجەی هەمو فەرمان و بەرهەڵستی و قەدەغەکردنەکانیان لە قورئان و سوننەتەوەو، بە پێی ئەو ڕێسایانە وەرگیرا بێت، کە ئوممەتی ئیسلام ـ بە درێژایی مێژوـ لەسەری کۆك بون، خۆ ئەگەر کەمێك لەو سەرچاوانەی شەرع لایاندا، ئیتر نە ملکەچییان بۆ دەردەبرێت و، نە گوێڕایەڵیشیان فەرز دەبێت، چونکە لە ئیسلامدا نابێت و بە هیچ شێوەیەك و بۆ هیچ کەسێك جائیز نییە، گوێڕایەڵی کەسێك لە سەرپێچی فەرمانی خوادا بکات! با ئەو کەسە سەرکردەش بێت، یان

پێشەواو خەلیفەی موسوڵمانانیش بێت. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ﴾ النساء/٥٩ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە،گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەرﷺبکەن، هەوەرها گوێڕایەڵی ئەو کاربەدەستانەش بکەن ، کە لە خۆتانن، جا ئەگەر لە کێشەیەکیشدا ڕاتان لێك جیاواز بوو، یان ناکۆکیتان کەوتە نێوان، ئەوا بگەڕێنەوە سەر فەرمانی خواو پێغەمبەرﷺ، ئەگەر ڕاست دەکەن و بە ڕاستی باوەڕتان هێناوە، خۆ ئەمە خێرەو ئەمەش چاکترین هەڵوێستی لێکدانەوەو بۆچونە... بە پێی ئەم ئایەتە، مەرجە کە ئەو کاربەدەستانەی ئێمە گوێڕایەڵییان دەکەین (ئەمیرو سەرۆك و خەلیفەو...)لە خۆمان بن، ئەوانیش وەکو ئێمە باوەڕیان بە ئیسلامەکە هەبێت و، پێوەی پابەند بن وسور بن لەسەر ڕاپەڕاندنی، گەر وا نەبون، ئەوە لە ڕیزی ئێمە دا نەماون و، ئێمەش بۆمان نییەگوێڕایەڵیان بین، چونکە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێ: ((لاطاعةَ لمخلوقٍ في مَعصيةِ الخالقِ))[1] هەروەها :((إنما الطاعةُ في المعروفِ)) واتە:

---

١ ـ نوسەر ـ ڕەحمەتی خوای لێ بێت ـ هیچ ئاماژەیەکی بە سەنەدی ئەو حەدیسەو حەدیسەکەی دوای ئەو یان بە سەرچاوەکەی نەکردووە، دیارە لەبەر ئەوەیە، کە هەردوو حەدیسەکە بەناوبانگن، چونکە بە لەفزی جیاواز لە بوخاری / کتاب المغازي (بە لەفزی: الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ) وموسلیم / کتاب الامارة (بە لەفزی الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ) و ئەبو داود / کتاب الجهاد (بە لەفزی :لاطاعة لمخلوق في معصية الخالق) و (لا طاعة في معصية الله إنما الطاعة في المعروف)، النسائي: کتاب البيعة (بە لەفزی: لا طاعة في معصية الله إنما الطاعة في المعروف) ومسند الامام احمد/ مسند العشرة المبشرين بالجنة بە لەفزي (إنما الطاعة في المعروف). هەموشیان ئەم ڕوداوە بە هۆی هاتنی حەدیسەکە دەگێڕنەوە:، کە ئامر مەفرەزەیەکی پێغەمبەرﷺ فەرمانی بە مەفرەزەکەی خۆی کرد، کە پوش و دار کۆکەنەوە، دوایی فەرمانی پێدان، کە ئاگری تێ بەردەن، ئینجا پێی ووتن بچنە ناوییەوە! ئەوانیش کەوتنە موناقەشە

گوێڕایەڵی هەر لەو فەرمانانەدا دەبێت ، کە بە دیدی شەرع چاکەن... چونکە موسوڵمان گوێڕایەڵی شەیتان و هەواو هەوەسی کافرو موشریك و بۆچونی مورتەدو فاسیق و بەرنامەی بیدعەچی و دەستبلاّوو بێ ئاگا لە ئیسلام ناکات... هەروەها گوێڕایەڵی کەسێك ناکات، کە خەڵکی بەرەو گومڕایی و دوور لە خوایی بەرێت. ئەوانە هەواو هەوەسی خۆیان کردوە بە خوای خۆیان و، بە گوێرەی داواکاریەکانی نەفس و نەوسی خۆیان دەجولێنەوە، خوای گەورە دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ ﴾ الجاثية/23 واتە: ئایا ئەو کەسەت ناسیوە ، کە هەواو هەوەسی خۆی کردۆتە خوای خۆی و شوێنی دەکەوێت ؟! شوێن کەوتنی ئەو کەسانە، هەر مایەی سەرگەردانی و وێڵی و گومڕایی و خۆدۆڕاندنە: ﴿وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ الانعام/116 واتە: ئەگەر گوێڕایەڵی زۆربەی خەڵکی سەر زەمین بکەیت، لە ڕێبازی ڕاستی خواویستی دورت دەخەنەوەو گومڕات دەکەن.

● ﴿ تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴾الشعراء/151
واتە: فەرمانی زێدەڕۆیان جێبەجێ مەکەن، ئەوانەی، کە هەر فەسادو خراپەکاری لەسەر زەمیندا دەنێنەوەو چاکە خوازی ناکەن...

---

وتیان: خۆ ئێمە بۆیە باوەڕمان بە پێغەمبەرﷺ هێناوە تا لە ئاگر رزگار بین. ئیتر کەس نەچووە ناوی، کە هاتنەوە ڕوداوەکەیان بۆ پێغەمبەرﷺ گێڕایەوە فەرموی: ئەگەر بچونایەتە ناوی، تا قیامەت نەدەهاتنەوە دەرەوە، ملکەچی و گوێڕایەڵی لە کاری چاکەدایە. (و)

• ﴿ نَزَّلْنَآ إِلَيْهِمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ وَكَلَّمَهُمُ ٱلْمَوْتَىٰ وَحَشَرْنَا عَلَيْهِمْ كُلَّ شَىْءٍ ﴾آل عمران/١٤٩
واتە: ئەگەر گوێڕایەڵی ئەو کەسانە بکەن، کە کافر بوون، لە ئاینەکەتان پاشگەزتان دەکەنەوە، ئیتر دوایی خۆتان زەرەرمەند دەبن.

• ﴿إِن تُطِيعُوا۟ فَرِيقًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ يَرُدُّوكُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ﴾ آل عمران /١٠٠
واتە: ئەگەر دوای باوەڕ هێنانتان بە محمد پێغەمبەر ﷺگوێڕایەڵی هەندێك لە مەسیحی و جولەکەکان بکەن، پاشگەزتان دەکەنەوەو، پاش باوەڕهێنانتان دەتان گێڕنەوەو بەرەو کوفر.

• ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوا۟ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ﴾ یس:٦٠ گوێڕایەڵی شەیتان مەکەن، چونکە ئەو دوژمنی سەرەکی ئاشکرای ئێوەیە...

گوێڕایەڵی هەر یەکێك لەوانە گومڕا بونەو شیرکەو، مانای وایە ئەوانەت بە خوای خۆت داناوە، ئەمەش پێچەوانەی شایەتمانەو کافر بونە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى ۙ ٱلشَّيْطَٰنُ سَوَّلَ لَهُمْ وَأَمْلَىٰ لَهُمْ ﴿٢٥﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَالُوا۟ لِلَّذِينَ كَرِهُوا۟ مَا نَزَّلَ ٱللَّهُ سَنُطِيعُكُمْ فِى بَعْضِ ٱلْأَمْرِ ۖ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ إِسْرَارَهُمْ ﴾ محمد /٢٥
واتە: ئەو کەسانەی لە ئایینەکە پاشگەز بونەوە ـ دوای ئەوەی ، کە نیشانەو بەڵگەی زۆری ڕێنمایی خوایی و خواویستیان بۆ ڕون بوەوە ـ ئەوە شەیتان پێی هەڵخلیسکاندن، هەرچەندە لە ڕاستیدا ئەوانە خۆیان هیدایەتی خواییان، سەرڕاستانە وەرنەگرتبوو، چونکە هەر بە کافرەکانیان دەوت: لە هەندێك فەرمان و ڕێنمایتاندا گوێڕایەڵیتان دەکەین!!!

کە کەوتیتە گوێڕایەڵی کەسانی لە خوایاخی و ملهوڕانی کوفر، ئەمـە حوکمـت دەبێت و بشزانە ، کە هەر خۆشت لێپرسراوی ئەو هەڵوێستەی خۆت دەبیت ..

ڕواڵەتی پاشگەزبونەوەی ئەوانە، کە خوای گەورە لەم ئایەتەدا باسـی فـەرموون ئەوەیە، کە گوێڕایەڵی کەسانێکیان کردووە، کە هەندێك لەو ئەحکامـە شـەرعیانە دەبوغزێنن، کە خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکـەیﷺ (نـەك باوەڕیـان بـە هەموی نییە، نەك باوەڕیشیان بەو هەنـدە ئەحکامـەش نییـە نـا، تـەنها پێیـان ناخۆشەو دەیبوغزێنن!! ) ئەم خاڵـەش تەوەرەیـەو لقـی تـری لـێ دەبێتـەوە وەك: گوێڕایەڵی نەکردنی پێغەمبەرﷺ، ئەمەش لە خوا یاخی بونە! چـونکە ئێمـە لـە ڕێگای پێغەمبـەرەوەﷺخوامـان ناسـیوە، ئـەحکامی خواییمـان لـەوەوە بـۆ ڕون بۆتەوە. بۆیە وەرگرتنی هەندێك سوننەتی ئەو هەیە، کە فەرزە لەسـەر موسـوڵمان وەری گرێت و پێوەی پابەند بێت، باوەڕیشی پێ نەبێت کافر دەبێت، ئەمما هەنـدێك سوننەتی هەیە، ئەگەر کابرا باوەڕی پێی بوو، بەڵام وەری نەدەگرت و پێوەی پابەند نەدەبوو، ڕەنگە بەوانە کافر نەبێت... هەندێکی تریش هەیە بە وەرنەگرتنیان کـافر نابن...

٦ـ حوکم کردن بە غەیری ئەو بەرنامەی خوا ناردویەتیە خوارەوە، چونکە خـوای گـــــەورە دەفـــــــــەرموێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾المائدة/ ٤٤ واتە: ئەو کەسەی بەوە حوکم نەکات، کـە خـوا ناردویەتیـە خوارەوە، کافرە.

• ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّـٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦ ﴿٦٠﴾ وَإِذَا

قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيْتَ ٱلْمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا ﴾ النساء/٦٠-٦١ واتە: ئەوانەت نەدیوە، کە لاف و گەزافی ئەوە لێ دەدەن، گوایە باوەڕیان بەوە هێناوە، کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە؟! هەروەها بەوەش، کە پێش تۆش هاتۆتە خوار؟! کەچی هەر ئەوانە خۆیان دەیانەوێت داوەری خۆیان ببەنە لای تاغوت! (شەیتان و بت و ئەو حاکم و داوەرانەی بە پێی شەرعی خوا داوەری و حوکم ناکەن) لای ئەو تاغوتەی، کە دەبوو باوەڕی پێ نەهێنن و شوێنی نەکەون و فەرمانەکانی وەرنەگرن! بەڵام ئەوەتا شەیتان سورە لەسەر ئەوەی، کە گومڕایان کات، گومڕاییەکی بێ ڕێ وجێ! کە پێشیان دەوترێت وەرنە سەر ڕێبازی خوا و داوەری بهێننە لای ئەو شەرعەی، کە خوا ناردویتیە خوارەوە، با پێغەمبەرﷺ ناو بژیوانتان بێت، دەبینیت دووڕوەکان پشت هەڵدەکەن و لالوتانە ڕو وەردەگێڕن و بەربەستیشت لە ڕێدا دادەنێن، تا خەڵکی تریش نەیەنە لات!!

• هەروەها دەفەرموێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴾النساء/٦٥ واتە: سوێند بێت بە خواکەی تۆ، باوەڕیان نییە تا تۆ نەکەنە ناوبژیوان و داوەریت لە هەموو ئەو کێشەو مەسەلانەدا نەهێننە لا، کە لە نێوانیاندا ڕو دەدات، تۆش داوەرییان دەکەیت، دوایی نابێت هیچ گرێ و گۆلێك لەسەر داوەریەکەی تۆ لە دڵ و دەرونیاندا دروست ببێت، ئەگینا موسوڵمان نامێنن!!

• ﴿ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ

كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴾ المائدة/٤٩ واتە: داوەری نێوانیان بەوە بکە، کە خوا بۆی ناردویەتە خوارەوە گوێ بە هەواو هەوەسی ئەوان مەدەو (گوێ لە ڕاوبۆچوونیان مەگرەو یاسای ئەوان جێبەجێ مەکە) ئاگادار بە تەفرەت نەدەن، وات لێ نەکەن واز لە هەندێك لەو ئەحکامانە بهێنیت، کە بۆت هاتۆتە خوارەوە! ئەگەر پشتیان هەڵکردو نەهاتن بە دەم حوکمی خواوە، ئەوە بزانە، کە خوا دەیەوێت بە تاوان و سەرپێچیەکانی خۆیان بیانگرێت و، توشی کوێرەوەرییان بکات، زۆربەی خەڵکی لە گوێڕایەڵی خوای پەروەردگار لایانداوەو کەوتونەتە گوناحەوە...

● باسی دووڕوەکانیش لەم بارەوە ئاوا دەکات:﴿ وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعْنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٌ مِّنْهُم مِّنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَمَآ أُو۟لَٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٤٧﴾ وَإِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُم مُّعْرِضُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن يَكُن لَّهُمُ ٱلْحَقُّ يَأْتُوٓا۟ إِلَيْهِ مُذْعِنِينَ ﴿٤٩﴾ أَفِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ أَمِ ٱرْتَابُوٓا۟ أَمْ يَخَافُونَ أَن يَحِيفَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَرَسُولُهُۥ ۚ بَلْ أُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٥٠﴾ إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَخْشَ ٱللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَآئِزُونَ ﴾ النور/٤٧-٥٢ واتە: دووڕوەکان دەڵێن: باوەڕمان بە خواو پێغەمبەرﷺهێناوە، ملکەچ و گوێڕایەڵین، کەچی دوای ئەوەی ئەمە دەڵێن کۆمەڵێکیان لەولاوە پشت هەڵ دەکەن و یاخی دەبن! ئەوانە موسوڵمان نین... کاتێك بەو دووڕوانە دەوترێت: وەرن حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی وەرگرن و داوەری بێننە لای ئەم، دەستەیەکی زۆریان هەر گوێی نادەنێ و خۆ لە حەق، کاس دەکەن! بەڵام ئەگەر زانیان حەقێکیان بۆ

دەستێنیتەوەو مافیان دەکەوێت، هەر زوو ملکەچانە بەرەو پیرت دێن! ئایا ئەوانە نەخۆشیی دڵی داگرتون ؟! یان لە پەیامەکەت دوو دڵ و ڕاڕا بون؟! یان لەوە دەترسێن خواو پێغەمبەری خوا ﷺ مافیان بخۆن؟!! نا، لە ڕاستیدا ئەوانە خۆیان هەر وا زاڵم و ستەمکارن و سەرپێچی حوکمی خوایان لا چاکەیە! ئەمما موسوڵمانان، کە بۆ داوەرێتی حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی ﷺ بانگ دەکرێن، دەست بەجێ دەڵێن: بەڵێ، گیان، گوێمان لە بانگهێشتەکە بوو، وا هاتین بەسەر چاوو دڵ! ئێمە گوێڕایەڵی خواو ئەو کەسەشین، کە حوکمەکەی هێناوە... ئەوانە سەرکەوتوو سەرفرازن. ئەوانەی، کە گوێڕایەڵی خوا و پێغەمبەرەکەی دەبن و، هەر لەو دەترسێن وبایەخ بە تەقواو پارێزکاری ئەو دەدەن، ئا ئەوانە سەرفرازن و ئەوانە ڕەزامەندی خوایان بۆ خۆیان مسۆگەر کردوە...

٧ـ بوغزاندنی بەشێکی ئیسلام، چونکە ئەمە بوغزاندنی هەموو ئیسلامە...

خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فَتَعْسًا لَّهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَٰلَهُمْ ﴿٨﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَٰلَهُمْ﴾ محمد /٨ـ٩ واتە: داماوی و سەرشۆڕی بۆ ئەو کەسانەیە، کە باوەڕیان نەهێناوەو کافرن، ئەوانە گومڕای ڕەنج بە خەسارن، چونکە ئەو ڕێنماییانەیان دەبوغزاند، کە خوای گەورە ناردیە خوارەوە، بۆیە خوای گەورەش کارو کردەوەکانیانی مایەپوت کرد...

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((لا يؤمِنُ أحَدُكمْ حتَّى يَكونَ هواهُ تَبَعاً لِمَا جِئْتُ بِهِ))[١] هیچ کەسێکتان باوەڕی نابێت، هەتا حەزو مەیلی نەبێتە شوێن کەوتوی

---

١ـ نوسەری ڕەحمەتی دەربارەی سەنەدەکەی دەفەرموێ: (ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: (حديث حسن صحيح، زانای تریش هەن، کە بە (صحيح) یان داناوە، بەڵام ابن رجب الحنبلي

ئەوەی، کە من هێناومە... حوکمی ئەم خاڵە ئەو کەسەش دەگرێتەوە، کە بـاوەڕی بە لقە حوکمێکی ئیسلام نەبێت، یان خۆشـیی پێـی نەیـەت و بیبوغزێنێـت، وەك پەرستنەکان، یان سیستمی ئابوری ئیسلامی، یان ئەحکامەکانی سەوداو مامەڵەی بازاڕ، یـان ڕێساکانی سیاسـەت، یـان یاسـاکانی جـەنگ و ئاشـتی، یـان پێگـە ڕەووشتیەکان، یان زانستی شەرعی!! یان ئایەتێکی قورئان، حەدیـسێکی ڕاسـتی پێغەمبەر ﷺ، یان گاڵتە کردنی بە سوننەتێك! (کردەوەی بێت، یان فەرمایـشتی یان بڕیاردانێکی لەسەر شتێك) هەر کەسێك هەر شتێك لەمانـە ببوغزێنێـت، لـە ئیسلام دەچێتە دەرەوەو پێی کافر دەبێت ..

٨ ـ کەسێك ژیانی دنیای لە ژیانی قیامەت پێ باشتر بێت و، فەزڵی ئەمیان بدات بەسەر ئەویاندا، یان هەر دنیا بکاتە یەکەم و کۆتا ئامانجی و هەموو ڕەنجێکی هەر بۆ خۆشگوزەرانی ئەم دنیایەی بێت. ئەوە ئەویش هەر پێچەوانەی شایەتمانەکە ڕەفتاری کردووە و، کەوتۆتە شیرکەوەو لێی قبوڵ ناکرێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَوَيۡلٞ لِّلۡكَٰفِرِينَ مِنۡ عَذَابٖ شَدِيدٍ ۝٢ ٱلَّذِينَ يَسۡتَحِبُّونَ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَيَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ وَيَبۡغُونَهَا عِوَجًاۚ أُوْلَٰٓئِكَ فِي ضَلَٰلِۭ بَعِيدٖ﴾ ابراهيم /٢ـ٣ واتە: با کافرەکان لە سزای سەختی وەیلدا (دۆڵێکە لە دۆزەخ) بە فەتارەت چن، مادام ژیانی دنیایان خۆشتر دەوێت و فەزڵی ئەم دەدەن بەسەر ژیانی دوا ڕۆژدا، ئەوانە بەردەوام لە ڕەنجی ئەوەدان، کە بەربەست بخەنە ڕێی بانگەوازی خوا، هەوڵ دەدەن ڕێبازەکەی خوا کەچ کەن و لارو وێری بخەنە ناو، ئەوانە بەڕاستی لە گومڕاییەکی بێ جێ و بێ ڕێدان...

---

لە کتێبی (جامع العلوم والحكم) دا بە سەحیحی دانەناوە ..) حەدیسەکە ژمارە چل و یەکەمی الاربعين النوويە یە هەر ئیمامی نەوەوی لە کتێبی (الحجە)دا دەفەرموێ: (صحيح).(و)

• ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَٰلَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لَا يُبْخَسُونَ ﴿١٥﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِى ٱلْءَاخِرَةِ إِلَّا ٱلنَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾ هود/١٥ واته: هەر کەسێك مەبەستی جوانی و خۆشی دنیا بێت، ئێمە مافی خۆی بە تەواوی دەدەینێ و یارمەتی تەواوی دەدەین و هاریکاری دەکەین، بەڵام لە ڕۆژی دواییدا غەیری ئاگری دۆزەخ، هیچی تریان نادر ێتیێ! چونکە هەرچییەك دەکەن لە ژیانی دنیایاندا لای خوا بێ نرخەو کارو کردەوەیان پووچەڵە.

• ﴿ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴾ الاسراء/١٨ـ٢٠ واتە: هەر کەسێك ژیانی دنیای بوێت (هەر ژیانی دنیای مەبەست بێت) و هەوڵ هەر بۆ ئەو بدات، ئێمە بۆ هەر کەسێك حەز بکەین پێی دەبەخشین، بەڵام حەتمەن دوایی زۆر بە زەلیلی و ڕیسوایی و سەرشۆڕییەوە دەیخەینە ناو ئەو دۆزەخەوە، کە بۆیمان تەرخان کردووە، هەر کەسێکیش ژیانی ئەو دنیای بوێت و موسوڵمانانە هەوڵی بۆ بدات و بۆی تێبکۆشێت، ڕەنجی ئەوانە جێی ڕێزەو هەوڵ و کۆششیان، جێ ڕێزو سوپاسەو سوپاسکراون، ئێمە نیعمەتەکانی خۆمان لە دنیادا لە خەزێنەو گەنجینەی خواکەت بە هەردوولایان دەبەخشین، خۆ بەخشینی پەروەردگارت لە کەس نەگیراوەتەوە ڕێی کەسیشی لێ نەگیراوە...

● ﴿ مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِى حَرْثِهِۦ ۖ وَمَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلدُّنْيَا نُؤْتِهِۦ مِنْهَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ مِن نَّصِيبٍ ﴾ الشورى/٢٠ واتە: هەر کەسێك بەدەست هێنانی بەرهەمی ڕۆژی دوایی مەبەست بێت، ئێمەش خێرو فەڕی زیاتر دەخەینە بەرهەمیەوە، بەرەکەت دەخەینە ڕەنجییەوە، هەر کەسێکیش هەر بە دەست هێنانی ژیانی دنیای لا مەبەست بوو، دەیدەنێ، بەلاَم لە ڕۆژی دواییدابێ پشك (بەش) دەکەوێت...

● خوای گەورە گرنگی وقەدری ژیانی دونیا بەم شێوەیە باس دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ ٱلشَّهَوَٰتِ مِنَ ٱلنِّسَآءِ وَٱلْبَنِينَ وَٱلْقَنَٰطِيرِ ٱلْمُقَنطَرَةِ مِنَ ٱلذَّهَبِ وَٱلْفِضَّةِ وَٱلْخَيْلِ ٱلْمُسَوَّمَةِ وَٱلْأَنْعَٰمِ وَٱلْحَرْثِ ۗ ذَٰلِكَ مَتَٰعُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسْنُ ٱلْمَـَٔابِ ﴿١٤﴾ قُلْ أَؤُنَبِّئُكُم بِخَيْرٍ مِّن ذَٰلِكُمْ ۚ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ عِندَ رَبِّهِمْ جَنَّٰتٌ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَرِضْوَٰنٌ مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴾ آل عمران ١٤ـ١٥ واتە: ئەو شتانەی دنیا، کە لەبەر چاوی خەڵکی جوان و ڕازاوە کراون، بریتین لە حەزو ئارەزوی هەبونی هاوسەرو منداڵی نێرینەو پارەو پوڵ و زێڕو زیو، هەروەها ئەسپی ڕەسەن و ماڵات و زەوی زارو کشت و کاڵ...ئەمانە هەمووی نازو نیعمەتی دنیان، بەلاَم خوای گەورە بۆ پیاوچاکان لای خۆی لە بەهەشت شتی وای ئامادە کردوە، کە دڵ شەیدای گەڕانەوە لای بێت. بەو خەڵکە ڕاگەێنە: ئایا هەواڵی چاکتر لەو نازو نیعمەتانەتان پێ ڕاگەێنم ؟! ئەویش ئەوەیە، کە بۆ ئەوانەی پارێزکارو خواناسن، لای خوای پەروەردگاریان باخی بەهەشتیان بۆ ئامادەیە، کە ڕوبارو کانیاویان بە ژێردا ڕەت دەبێت و هاوسەری پاك و پاکژیان دەدر ێتێ، لەسەر هەمووشیەوە

ڕەزامەندی خوایان دەست دەکەوێت، خوا بە بەندەکانی بینایە و ئاگای لە هەمووانە...

• ﴿ ٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَزِينَةٌ وَتَفَاخُرٌۢ بَيْنَكُمْ وَتَكَاثُرٌ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ ۖ كَمَثَلِ غَيْثٍ أَعْجَبَ ٱلْكُفَّارَ نَبَاتُهُۥ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَىٰهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَكُونُ حُطَٰمًا ۖ وَفِى ٱلْءَاخِرَةِ عَذَابٌ شَدِيدٌ وَمَغْفِرَةٌ مِّنَ ٱللَّهِ وَرِضْوَٰنٌ ۚ وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَآ إِلَّا مَتَٰعُ ٱلْغُرُورِ ﴾الحدید/٢٠ واتە: بزانن، کە هەمو ژیانی دنیا، یاری منداڵ و گاڵتەی هەرزەو خۆڕازاندنەوەو شانازی کردنی نێوانتانە بە زۆر بونی سەروەت و سامان و ڕۆڵەو ڕەچەڵەکتانەوە! ئەمانە هەموی وەك تاوە بارانێکە، کە جوتیاری پێ دڵخۆش دەبێت، کە دەبێتە مایەی سەوز بونی حاسڵاتەکەی دەگەشێتەوە، بەڵام هەر زو دەیبینیت زەرد هەڵگەڕاوە، ئینجا دەبێتە کۆتەرەو پلو پوش!! لە ڕۆژی دواییشدا بۆ پیاوخراپان دەبێتە سزای پڕ ژان و ئێش! بۆ پیاوچاکانیش دەبێتە مایەی لێبوردنی خوایی... بەڕاستی دنیا هەر هی هەڕاڵ (مەغرور) بونە، هی فریو خواردن و دەستخەڕۆ بونە...

ـ هەروەها سیفەتی ئەو کەسانە دیاری دەکات، کە پیاوی ئەو دنیان وشەیدای پاداشتی لای خوان و بەسەر سەد کەندو کۆسپی دنیادا هەر بەرەو خوا دەکشێن، هەڕەشەی سەخت و توندو تیژیش لەو موسوڵمانانە دەکات، کە زۆر پەیوەستی دنیان و وا باوەشیان بە ژیاندا کردوە، کە جیهادیان فەرامۆش کردوە!

• ﴿ قُلْ إِن كَانَ ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ وَإِخْوَٰنُكُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَٰلٌ ٱقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَٰرَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَٰكِنُ تَرْضَوْنَهَآ أَحَبَّ إِلَيْكُم

مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَجِهَادٍ فِى سَبِيلِهِۦ فَتَرَبَّصُوا۟ حَتَّىٰ يَأْتِىَ ٱللَّهُ بِأَمْرِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ﴾ التوبة/٢٤ واتە: بڵێ: موسوڵمانینە، ئەگەر باوك و كوڕو براو هاوسەرو تیرەو هۆزو ئەو پارەیەی، كۆتانكردۆتەوەو ئەو بازرگانیەی دەترسێن بازاڕی بشكێت وئەو خانوو كۆشك و تەلارانەی دڵتان پێیان دەكرێتەوە، گەر ئەمانەتان لا خۆشەویستره وەك لە خواو لە پێغەمبەرەكەی و جیهادی ڕێی خواویستی، دە چاوەڕوانی سزای سەختی خوا بن، خوا كەسانی فاسقی خۆش ناوێت، كەسانێكی وای پێ پەسەند نییە، كە لەبەر خاتری دنیا سەرپێچی فەرمانەكانی دەكەن...

٩ـ گاڵتە كردن بە ئیسلام: بە قورئان یان بە سوننەت، یان بە شوێن كەوتنی ئەو دوانە، بەو سیفەتانەیان، كە هی خواو پێغەمبەرن، یان گاڵتە كردن بە فەرمانێك لە فەرمانەكانی خوای پەروەردگار، یان بە دروشمێكی ئیسلام... ئیبنو عومەر و محمدی كوڕی كەعب و زەیدی كوڕی ئەسلەم و قەتادە ـ خوا لێ یان ڕازی بێت ـ گێڕاویانەتەوە[1]، كە جارێك كابرایەك لە غەزای تەبوكدا ووتی: قەت وەك

١- نوسەری ڕەحمەتی ئەوەی سەرەوەی لە ابن جرير الطبري و ابن مردويە نەقڵ كردووەو هیچ ئاماژەی بە سەنەدیان نەداوە. ئەم داستانە بەناوبانگە، زۆرینەی ئەوانەی تەفسیریان كردووەو هۆی هاتنە خوارەوەی ئایاتیان نووسیوەتەوە گێڕاویانەتەوە وەكو (ابن كثير ٢/٣٣٢) ئەمما لە ڕوی سەنەدەكەیەوە بەم شێوەیەیە: شێوازی گێڕانەوەكە: لە چەند ڕێگایەكەوەیەو تێكەڵ كراوە یان بڵێین: كراون بەیەك، چونكە جاری وا هەیە زانایەكی حەدیس ڕەوانی وەكو ئیمامی الزوهری سەیر دەكات حەدیسێكی لە لایە، كە لە سێ كەسەوە بۆ نموونە ڕیوایەت كراوە، بەڵام هەندێك ڕستەی حەدیسەكە لای ئەمیان جیاوازی هەیە وەك ئەوەی لای ئەوی تریان، یان لای سێیەمیان... هەروەها بۆیە زانایانی حەدیس ئەم جۆرە حەدیسانەیان لا قبوڵ بووە بەو مەرجەی هەر هەمو ڕاویەكان مەرجی حەدیس گێڕانەوەیان تێدا بو بێت (وەكو موسوڵمانێتی و دادپەروەری و كۆنترۆڵ كردنی (الضبط)ی حەدیسەكەو... هتد) ئەم حەدیسەش وایە. ئیبنو عومەر یاوەرە (سەحابە) و سیانەكەی تر تابعینن، ڕیوایەتی ئیبنو عومەر (مەرفوع)ە و هی

ئەمانە چاو برسی و درۆزن و ترسنۆکم نەدیوە (مەبەستی لە پێغەمبەرﷺ و یاوەرەکانی بوو) عەوفی کوڕی مالیك گوێی لێ بوو، لێی هەڵگەڕایەوەو پێی ووت: درۆت کرد، هەی دووڕو، دەبێت هەر ئێستا بچمە خزمەت پێغەمبەروﷺ شکاتت لێ بکەم، کاتێك عەوف دەچوە خزمەتی پێغەمبەرﷺ، ئەو بە سواری وشترێکەوە بوو، وەحی بۆ هات، کابراش خێرا خۆی گەیاندێ و زو کەوتە پاکانەی خۆی! ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا، بەو هیوایەی کەمێك نارەحەتی ڕێمان دەرکەین، دەربارەی کاروان و گەشتی خۆمان قسەمان دەکرد، ئیبنو عومەر دەفەرموێ: کابرا خۆی بە هەوساری وشترەکەی پێغەمبەردا ﷺ هەڵڕۆسکاند بوو، لە تاوا هەر لەسەر نوکی پەنجەی دەڕۆیشـت، هەر دەیووت: ئــــــەی پێغەمبەری خوا، ئێمە تەنها دەربارەی گەشت و کاروانی خۆمان قسەمان دەکــرد، تا ماندویی ڕێمان دەرکەین، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە گاڵتەتان بە خــواو بە ئایەتەکــــــــانی و بە پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکرد ؟! هەر ئەوەی دەفەرمو، لاشــی لە کابرا نەدەکردەوە، ئینجا ئەو کاتە ئەو ئایەتە هاتە خــــــــــوارەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْذَرُ الْمُنَافِقُونَ أَن تُنَزَّلَ عَلَيْهِمْ سُورَةٌ تُنَبِّئُهُم بِمَا فِي قُلُوبِهِمْ ۚ قُلِ اسْتَهْزِئُوا إِنَّ اللَّهَ مُخْرِجٌ مَّا تَحْذَرُونَ ﴿٦٤﴾ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ ۚ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ۚ إِن نَّعْفُ عَن طَائِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَائِفَةً بِأَنَّهُمْ

---

ئــەوانی تــر پێــی دەوترێــت (مورسـەل) واتــە: یەکــسەر تابعینێــك دەڵــێ: پێغەمبــەر ﷺ فەرموویەتی، واتە لە نێوان ئەو تابعینەو پێغەمبەردا ﷺ یاوەرێك هەیە، عادەتــەن ئــەو زانــا حەدیسەوانانە لە باسی ئەو جــۆرە حەدیــسانەدا دەفــەرموون: دخـل حـديث بعـضهم في بعـض، یان:حدثني بعضهم بكذا وبعضهم بكذا یان عیباراتي تري وا... (و) .

﴿...كَانُوا مُجْرِمِينَ﴾التوبة/٦٤ـ٦٦ واتە: دووڕوەكان لەوە دەترسن، كە سورەتێكی قورئان دەربارەیان بێتە خوارەوەو، هەرچی لە دڵ و دەرونیاندایە بۆ موسوڵمانانی بخاتە ڕوو! تۆ پێیان بڵێ: گاڵتەجاڕی خۆتان بكەن!! ئاخری خوای گەورە ئاوا كەشفتان دەكات، هەرچی لە دڵتاندایە دەیخاتە ڕوو، ئەگەر لێشیان بپرسیت، تەئكید دەكەنەوە، كە گوایە سوعبەتیان دەكرد، پێیان بڵێ: ئەوە گاڵتەتان بە خواو بە ئایەتەكانی و بە پێغەمبەرەكەیﷺدەكرد؟! چیدی بەهانەی درۆو دەلەسە مەهێننەوە، ئێوە تیرو توانجتان دەگرتە پێغەمبەرﷺئەمەش پاشگەزبوونەوەتانە، گەر لەوانەشتان خۆش بین، كە پەشیمان بوونەتەوەو تۆبەیان كردوە، حەتمەن ئەوانی ترتان هەر توشی ئازارو دەردەسەری دەكەین، چونكە یاخی و تاوانبارن ..

كەوا بوو گاڵتە كردن بە هەر بەشێكی ئیسلام، بە هەر دروشمێكی بێت، یان بە دەقێكی قورئان و حەدیسی سەحیح بێت، هەر كافر بونە، چونكە پێچەوانەی شایەتمانە... بۆ نمونە یەكێك بڵێت: چییە؟ دەتانەوێت بمانگێڕنەوە بۆ شەریعەتی هەق بە هەقی دان بە دان و چاو بە چاو؟! یان، كە گوێی لە ئایەتێك، یان حەدیسێك ببێت بڵێ: بابە واز لەم قسە هیچ و پوچانە بهێنن! یان دەربارەی مەسەلەیەكی ئیسلامی بڵێ: ئێوە چیتانە؟! لەم ئیسلامەتیەدا هەر توێكڵەكەیتان گرتوە؟! وەك بیەوێت ئەوە بسەلمێنێت، كە ئیسلام بەشێكی توێكڵەو پێویستە داڕنرێت و بەشێكی تریشی كرۆك و ناوكە!! تەنانەت لە پێچەوانەی شایەتمان و مورتەد بونەوەیە، ئەگەر یەكێك گاڵتە بە ڕیش (ڕدێن)ی موسوڵمانێك (بەو سیفەتەی، كە هێماو سیمایەكی ئیسلامە) بكات! چ جای بە نوێژو ڕۆژو، یان نوێژ خوێن و ڕۆژوەوان... یان گاڵتە كردن بە زانستیە شەرعیەكانی وەكو خوابەیەكناسی (التوحید) و فیقە و هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتی قورئان و..هتد، یان بە زاناو

شەرعناسانی ئیسلام، بە ئیهانە کردنیان، بە ڕێز شکاندنیان، بەو سیفەتەیان، کە کادیری ئیسلامن، یان گاڵتە کردن بە عیلمەکەیان، کە گوایە هیچی تر غەیری زانستی ئایینی نازانن! زۆر شتی تریش لەم بابەتانەی، کە نەك هەر کافرو دووڕووەکان تێی دەکەون، بە داخەوە هەندێك لە موسوڵمانانیش ـ لە نەزانیین و بایەخ پێ نەدانیاندا ـ تێی دەکەون!! بێژەری هەر یەکێك لەمانەی باس کراو هی هاوشێوەی تریشی، لە بازنەی ئیسلامەتی پێیان دەچێتە دەرەوە و فڕی ئیسلامی بەسەرەوە نامێنێت! ئاخر بۆیە پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((وَإِنَّ العبدَ لَيتكلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ سَخطِ اللهِ لا يَلْقِي لَهَا بَالاً يَهوي بِهَا في جَهَنَّمَ)) رواه البخاري[1] واتە: لەوانەی کابرایەك وشەیەکی لەوەی مایەی ڕق هەستانی خوایە لە دەم بێتە دەرەوە، بێ ئەوەی خۆی بایەخی پێ بدات، بەڵام دەبێتە هۆی فڕێ دانیە ناو دۆزەخەوە...

١٠ـ حەڵاڵ کردنی شتێك، کە ئیسلام حەڕامی کردووە، یان حەڕام کردنی شتێك، کە ئیسلام حەڵاڵی کردوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يَفْتَرِي ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ ۖ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰذِبُونَ ﴾ النحل /١٠٥ واتە: ئەو کەسانە درۆ بە دەم خواوە هەڵدەبەستن، کە باوەڕیان بە نیشانەو بەڵگەکانی ئەو نییە، ئەوانە هەر درۆزنن. درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە بریتییە لە حەڵاڵ کردنی ئەوەی، کە ئەو حەڕامی کردووە، یان حەڕام کردنی ئەوەی، کە ئەو حەڵاڵی کردوو، ئەمەش یەکێکە لە گەورەترین تاوانەکانی مرۆڤ بە لە ڕوانگەی ئیسلامەوە، پەروەردگار دەربارەی دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ

---

١) البخاري لە صحيح وابن حجر لە الفتح (٣٠٨/١١) والامام أحمد (٣٣٤/٢) هەمو حەدیسەکەش ئەمەیە: ((إِنَّ العَبْدَ لَيَتَكَلَّمُ بالكَلِمَةِ لا يَلْقِي لَهَا بَالاً يَرْفَعُهُ اللهُ بِهَا دَرَجَاتٍ وَإِنَّ العبدَ لَيتكلَّمُ بالكَلِمَةِ مِنْ سَخطِ اللهِ لا يَلْقِي لَهَا بَالاً يَهوي بِهَا في جَهَنَّمَ))(و).

ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴾ النحل/١١٦ واتە: هەر وا بە قسەی سەرزارەکیتان مەڵێن ئەمە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، درۆش بە ناوی خواوە دروست مەکەن، ئەوانەی درۆ بەدەم خوای گەورەوە هەڵ دەبەستن، سەرکەوتو نابن، کەمێك سودیان پێ دەگات و لەزەتی لێ دەکەن، بەڵام دوایی دوچاری ئەو سزا سەخت و بەژانە دەبن، کە بۆیان دانراوە...

● هەروەرها دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ۖ يُضَلُّ بِهِ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُحِلُّونَهُۥ عَامًا وَيُحَرِّمُونَهُۥ عَامًا لِّيُوَاطِـُٔوا۟ عِدَّةَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ فَيُحِلُّوا۟ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ ۚ زُيِّنَ لَهُمْ سُوٓءُ أَعْمَٰلِهِمْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾التوبة /٣٧ واتە: دواخستنی مانگەحەرامەکان، یان گۆڕینیان بۆ مانگی تر[١] (واتە دەسکاری کردنی یاسای کۆمەڵایەتی جەنگ و ئاشتی)، نەك هەر کوفرە بەڵکو کوفرەو لەبان کوفرە! چونکە دەبێتە مایەی گومڕایی و سەرگەردانی کافرەکان، لەبەر ئەوەی ساڵێك بە حەڵاڵی دادەنێن و ساڵێکی دی بە حەرام! ئاوا دەیانەوێت لەگەڵ ئەو مانگانەی خوای گەورە بە حەرام ناساندونی

١ ـ لەبەر ئەوەی لە عورفی کۆمەڵایەتی و سیاسی عەرەبەکانی پێش ئیسلامدا وا بـو، کـە نابێت لەو مانگانەدا شەڕ بەرپا بکرێت، کە پێیان دەوترا مانگە حەرامـەکان (الاشـهر الحرم)، کە بریتی بون لە(موحەڕەم و ڕەجەب و شـەعبان و زیلحیججـە)، بـەڵام جـاری وا هـەبو ـ بـە گوێرەی بەرژەوەندی زلهێزەکانیان ـ شەڕیان لە یەکێك لەو مانگانەدا بەرپا دەکرد، (بۆ نمونە لـە ڕەجەبدا)، بەڵام لە جیاتی ئەو مانگە، مانگێکی تری ئەو ساڵەیان (بۆ نمونە شەعبان) دەکـردە مانگی حەرام!! خوای گەورەش ئەمەی ـ کە ناوی النسیئە ـ لێ کردنە بەڵگەی یاسا دانان بـە گوێرەی کەیف و بەرژەوەندی!! کە لە ئیسلامدا بە نیشانەی کافر بونی ناساند...(و).

تێکیان هەڵکێشن! تا ئەوەی خوا بە حەڕامی داناوە، ئەمان حەڵاڵی کەن! ئەم ڕەفتارە ناقۆڵانەیان لا جوان کراوە، بەڵام خۆ خوا هیدایەتی کەسانی کافر نادات.

حەڕام کردنی ئەو شتانەی خوای گەورە حەڵاڵی کردون و، حەڵاڵ کردنی ئەوانەی ئەویش حەڕامی کردون، کوفرە، پەلە کردن لە شت حەڕام کردن، وەك پەلە کردنە لە شت حەڵاڵ کردن، خەڵکیش هەیانە زێدەڕۆیی دەکەن و زۆر شت حەڕام دەکەن، هەشیانە شلگیرن و نایانەوێت هیچیان لێ حەڕام بێت! هەردو هەڵوێستەکەش هەڵەن! موسوڵمان بۆی نییە ڕای خۆی بخاتە پێش ڕێنمایی خواو پێغەمبەرەوەﷺ، هیچ ڕایەکیش لەسەر هیچ مەسەلەیەك دەرنابڕێت، تا نەزانێت حوکمی شەرعی ئەو مەسەلەیە چییە؟ چونکە دەزانێ ئەمە پێچەوانەی شایەتمانە و سەرپێچییە لە فەرمانی خوا، کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَىِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾الحجرات / ١ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ڕای خۆتان پێش خواو پێغەمبەری خوا دەرمەبڕن و پێشنیاریان مەخەنە پێش!

١١ـ باوەڕ نەهێنان بە هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەتی ڕاستی پێغەمبەرﷺ: چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿أَفَتُؤْمِنُونَ بِبَعْضِ ٱلْكِتَـٰبِ وَتَكْفُرُونَ بِبَعْضٍ ۚ فَمَا جَزَآءُ مَن يَفْعَلُ ذَٰلِكَ مِنكُمْ إِلَّا خِزْىٌ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُرَدُّونَ إِلَىٰٓ أَشَدِّ ٱلْعَذَابِ ۗ وَمَا ٱللَّهُ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾البقرة/٨٥ واتە: ئایا باوەڕتان بە هەندێك ئایەت هەیەو، باوەڕتان بەوانی تری نییە ؟!! خۆ سزای ئەو کەسەی، کە ئاوایە سەرشۆڕی دنیایەو لە ڕۆژی دواییشدا ڕادەکێشرێتە ناو سەختترین سزاوە، خۆ خوا بێ ئاگا نییە لەو کردەوە بەدو چەپەڵانەی، کە ئەنجامی دەدەن...

پێغەمبەریش ﷺ دەفەرموێ: ((هلْ عَسَى رَجُلٌ يَبْلُغُهُ الحديثُ عَنِّي وهُوَ مُتَّكِئٌ عَلَى أَرِيكَتِهِ فيقول: بينَنَا وبينَكُمْ كتابُ اللهِ، فَمَا وَجَدْنَا فيهِ حَلَالاً اسْتَحْلَلْنَاهُ ومَا وَجَدْنَا فيهِ حَرَاماً حَرَّمْنَاهُ وإنَّ مَا حرَّمَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلم كمَا حَرَّمَ اللهُ)) رواه الترمذي وقال حديث حسن صحيح و رواه مالك[1] واتە: ئەرێ ڕەنگە کابرایەك ـ لەو کاتەیدا، کە لەسەر دۆشەك و سەکۆی حەوانەوەی پاڵی لێ داوەتەوە ـ حەدیسێکی منی پێ بگات، یەکسەر بڵێ: نا، ئەوەی لە نێوان ئێمەو ئێوەدایە قورئانەکەیە، ئەو چی حەڵاڵ کردبێت بە حەڵاڵی دەزانین و، چیشی حەرام کردبێت بە حەرامی دەزانین (وەك بڵێی: ئیتر حەقمان بەسەر حەدیسەوە نییە) نا، نەخێر، ئەوەی، کە پێغەمبەری خواش ﷺ حەرامی کردووە هەر وەکو ئەوەیە، کە خوای گەورە حەرامی کردوە...

هەروەها دەفەرموێ: ((تركتُ فيكُمْ امرينِ لَنْ تَضِلُّوا مَا تَمَسَّكْتُمْ بهما: كتابَ اللّهِ وسُنَّةَ رسولِهِ)) رواه الامام مالك واتە: دوو شتم بۆتان بەجێ هێشتوە گەر دەستیان پێوە بگرن، هەتا ماون گومڕا نابن: کتێبەکەی خواو سوننەتی پێغەمبەرەکەی ﷺ.

باوەڕ نەهێنان بە شتێك لە دەقەکانی قورئان، پێچەوانەی شایەتمانەو کوفرە، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ الحجر/۹ واتە: ئێمە خۆمان قورئانمان ناردۆتە خوارەوەو خۆشمان پارێزگاری ئەوین... باوەڕ

---

[1] ـ الترمذي كتاب العلم باب ۱۰ ژمارە (۲٦٦٤) وابو داود، کە پێش ئەو لەفزە ئەمەی هێناوە: (ألا وإني أوتيت القران ومثله معه) واحمد له المسند (يوشك أحدكم أن يكذبني وهو متكئ على أريكته يحدث بحديثي فيقول بيننا وبينكم كتاب الله فما وجدنا فيه من حلال استحللناه وما وجدنا فيه من حرام حرمناه إلا وإن ما حرم رسول الله صلى الله عليه وسلم مثل ما حرم الله).و

نەهێنان بە سوننەتێکی ڕاست و سەلمێنراوی پێغەمبەریشﷺ هەر پێچەوانەی شایەتمانەو هەر کوفرە، چونکە بە درۆخستنەوەی پێغەمبەرﷺ، بە درۆخستنەوەی ئەویش لە بچوکترین شتیدا کوفرە... جا چۆن بە ڕاست نەزانینی سوننەتی ڕاست سەلمێنراوی دەماودەم گێڕراوە، پێچەوانەی شایەتمانەو کوفرە، زیاد کردنی ئەنقەستی وشەو ڕستەی تریش بۆ حەدیس هەر پێچەوانەی شایەتمانەو کوفرە... چونکە پێغەمبەرﷺ خۆی دەفەرموێ: (من كذب على نبيه أو ... او على والديه لم يرح رائحة الجنة) حديث حسن رواه الطبراني في الكبير[1] واتە: هەر کەسێك درۆیەك بە دەم پێغەمبەرەکەیەوە... یان بە دەم دایك وباوکیەوە هەڵبەستێت، بۆنی بەهەشت ناکات... هەروەها دەفەرموێ: ((مَنْ حَدَّثَ عَنِّي حَدِيثًا وَهُوَ يَرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبَيْنِ)) رواه مسلم والترمذي. واتە: هەر کەسێك قسەیەك ـ، کە دەزانێت درۆیە ـ بە دەم منەوە بگێڕێتەوە، خۆشی یەکێکە لە درۆزنەکان...

١٢ـ پشتگیری کافر و دووڕوان و قبوڵ کردنی سەرپەرشتیارێتییان، هەروەها خۆش نەویستنی موسوڵمانان وخوا بەیەك ناسان، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ۘ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَـٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ

---

١ ـ لە هیچ سەرچاوەی تری حەدیس ئەم حەدیسەم نەدۆزیەوە، کتێبی العمجم الکبیرەکەی تەبەرانیشم ـ بە داخەوە ـ لا نییە. بەڵام حەدیسی تر لەو بارەوە زۆرە وەکو ئەوەی نوسەری رەحمەتی دواتر هێناویتیەوە، کە ئەویش جگە لە ئیمامی موسلیم و ئەحمەد هەر شەش خاوەن (السنن) ەکان گێڕاویانەتەوە، یەکێك لەو ریوایەتانە: (من قال علي ما لم أقل فليتبوأ مقعده من النار)، کە شێخی ئیبن باز دەفەرموێ: متفق على صحته (و).

عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴾ المائدة/٥١-٥٣ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، جولەکەو دیانان ـ لە جێی موسوڵمانان ـ مەکەنە سەرپەرشتیاری خۆتان، ئەوانە لە ناو خۆیاندا پشتی یەکتر بەرامبەر موسوڵمانان دەگرن و، دژایەتی ئەو کەسانە دەکەن،کە لە ئایین و میللەتی خۆیان نین، ئاخر هەر کەسێکتان پشتیوانی لەوان بکات و بە سەرپەرشتی خۆییان قبوڵ بکات، حوکمی ئەویش وەکو هی ئەوانی لێ دێت! خواش هیدایەتی خەڵکانی ستەمکار نادات. دەبینیت ئەوانەی دڵ و دەرون نەخۆشن ڕادەکەنە لای ئەو کافرانەو دەچنە ڕیزنەوە، دەڵێن: ئاخر دەترسێین ڕۆژێك بێت دوچاری کێشەو بەڵا ببین، با لای ئەوان دەستێکمان هەبێت! باشە ئەگەر خوای گەورە سەرکەوتنی بە موسوڵمانان بەخشی و ئەوان سەرکەوتن (ئەگەر مەککەیان ڕزگار کرد)، یان هەر فەرمانێکی تری ئەو بۆ موسوڵمانان دەرچێت، کە زاڵ بن و دەسەڵات بگرنە دەست، جا دەبینیت چۆن ئەو دەرون نەخۆشانە پەنجەی پەشیمانی دەگەزن و ژێوان دەبنەوە،. ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە بە سەرسامیەوە دەپرسن: ئەمە ئەوانەن، کە ئەو هەمو سوێندەیان بۆ ئێمە دەخوارد، کە لەگەڵتانین ؟! ئەمە ئەوانەن ؟!! جا ئەوانە کارو کردەوەیان مایەپووچ دەبێت و بێ پاداشت، ڕیسواو زەرەرمەند دەبن...

● هەروەها دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾المائـدة/٥٧ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئەو کەسانە مەکـەن بـە سەرپەرشـتیارو بەرپرس و جێ متمانەی خۆتان، کە ئایینەکەتانیان دەکردە مایەی گاڵتـەو گـەپ و

گەمەی کۆڕیان، چ لەوانەی، کە ئەهلی کیتابن، چ کافرانی تر، لە خوا بترسن و پارێزکار بن، ئەگەر ڕاست دەکەن و موسوڵمانن...

• ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتُ بَعْضُهُم مِّنۢ بَعْضٍۢ ۚ يَأْمُرُونَ بِٱلْمُنكَرِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمَعْرُوفِ وَيَقْبِضُونَ أَيْدِيَهُمْ ۚ نَسُوا۟ ٱللَّهَ فَنَسِيَهُمْ ۗ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٦٧﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْمُنَٰفِقَٰتِ وَٱلْكُفَّارَ نَارَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ هِىَ حَسْبُهُمْ ۚ وَلَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌۭ مُّقِيمٌۭ ﴾ التوبة/٦٧ـ٦٨ واتە: ژن و پیاوی دووڕوەکان سەر بەیەکن و هەمویان، هەر فەرمان بە خراپەو بەرهەڵستی لە چاکە دەکەن، پیسکەو ڕەزیلن، ئەوان خۆیان لە بیر کردوەو خوای گەورەش ئەوانی فەرامۆش کردوە(ئیهمالی کردون و لە ڕەحمەت و بەزەیی خۆی بێ بەشی کردون). بەڕاستی دووڕوەکان لە فەرمانی خوای گەورە دەرچون و کافر بون، بۆیە خوای گەورە بەڵێنی بە ژن و پیاوە دووڕوەکان و بە کافرەکانیشی داوە، کە حەتمەن دەیانخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوەو، بە هەتا هەتاییش دەبێت تێیدا بمێننەوە، دۆزەخیش بەسە بۆیان، دۆزەخ لە عەوەیان دێت، خوا نەفرینی لەو دووڕو کافرانە کردوەو بڕیاری داوە، کە سزاو ئازارێکی زۆر بە ژان و ئێشی هەمیشەییان بێنێتە ڕێ...

•﴿ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴾ النساء/١٣٨ـ١٣٩ مژدە بدە بە دووڕوەکان، کە لە خواوە سزایەکی سەختیان بۆ دانراوە، ئەوانەی، کە ـ لە جیاتی موسوڵمانان ـ کافرەکان دەکەنە سەرپەرشتیارو بەرپرسی خۆیان، چما

بە هیوای وەدەست هێنانی دەسەڵات و هێزو عیزەتیان دەچنە پاڵ ئەوان ؟!! ئاخر خۆ هەمو دەسەڵاتی تەواوی بێ هاوتا، هەر هی خوای پەروەردگارەو بەس ؟!

• ﴿ وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ الَّذِي آتَيْنَاهُ آيَاتِنَا فَانسَلَخَ مِنْهَا فَأَتْبَعَهُ الشَّيْطَانُ فَكَانَ مِنَ الْغَاوِينَ ﴿١٧٥﴾ وَلَوْ شِئْنَا لَرَفَعْنَاهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُ أَخْلَدَ إِلَى الْأَرْضِ وَاتَّبَعَ هَوَاهُ ۚ فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ الْكَلْبِ إِن تَحْمِلْ عَلَيْهِ يَلْهَثْ أَوْ تَتْرُكْهُ يَلْهَث ۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ الْقَوْمِ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا ۚ فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١٧٦﴾ سَاءَ مَثَلًا الْقَوْمُ الَّذِينَ كَذَّبُوا بِآيَاتِنَا وَأَنفُسَهُمْ كَانُوا يَظْلِمُونَ ﴾الاعراف/١٧٤-١٧٧

واتە: باسی ئەو کابرایەیان بۆ بکە، کە چەندین ئایات و بەڵگەی خۆمان پێدا بوو، کەچی ئەو هەموی لەبەر خۆی داماڵی و وای لێ هات شەیتان کەوتە شوێنی!! زەرەری کردو چووە ڕیزی گومڕایانەوە، ئەگەر حەزمان کردایە هەر ئەو ئایەتانەمان دەکردە مایەی پلەبەرزی و سەرفرازیی، بەڵام ئەو خۆی باوەشی بە دنیادا کردو ویستی بە نەمری لەسەر زەمیندا بمێنێتەوە! نمونەی ئەمە وەکو سەگە، ڕاوی دەنێیت، هەر زمانی دەرکێشێت و هانکە هانکێتی، لێی دەگەڕێیت هەروەتر: زمانی دەرکێشاوەو هانکە هانکێتی! نمونەی ئەو کەسانەش، کە ئایەتەکانی ئێمە بەدرۆ دەخەنەوە، وەکو ئەو سەگە وان، ئەم داستان و نمونانەیان بۆ بگێڕەرەوە، بەڵکو هۆشێکیان بێتەوە بەبەردا، بەڕاستی نمونەو حاڵی ئەو کەسانەی ئایات و بەڵگەکانی ئێمەیان بە درۆ دەخستەوە خراپ و، ناقۆڵاو دزێوە، ئێ هەر خۆیان ستەمەکەیان لە خۆیان کرد.

زۆرینەی موفەسسیرەکان ڕایان وایە، کە ئەم ئایەتانە باسی کابرایەکی بەنی ئیسرائیلی دەکەن، کە ناوی بەلعەمی کوڕی باعورا بوو، کە سەرەتا باوەڕی بە

بانگەوازەکەی موسا هێنا بوو، بەڵام دوایی بۆ ماڵی دنیاو بە بەرتیلی حاکمی ئـەو زەمانە هەڵگەڕایەوەو، کەوتە شوێن هەواو هەوەسی خۆی و بابای حاکم، بۆیـە بـو بە سەگی هار!!

۱۳ـ بێ ئەدەبی بەرامبەر بە پێغەمبەرﷺ: چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَرْفَعُوٓاْ أَصْوَٰتَكُمْ فَوْقَ صَوْتِ ٱلنَّبِيِّ وَلَا تَجْهَرُواْ لَهُۥ بِٱلْقَوْلِ كَجَهْرِ بَعْضِكُمْ لِبَعْضٍ أَن تَحْبَطَ أَعْمَـٰلُكُمْ وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾ الحجرات/۲ واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، دەنگتان بەسەر دەنگی پێغەمبەرداﷺبەرز مەکەنەوەو لە دورەوە بانگی مەکەن، هەر وەکو لە ناو خۆتاندا هاوار لە یەکتری دەکەن! نەبادا کارو کردەوەکانتان پوچ هەڵگەڕێن و ئێوەش پێ نەزانن، دوایی لێتان تێك چێت و وا بزانن کارو کردەوەکانتان لە فەڕو بەرەکەتی خوادا زۆر بوە...

هەڕەشە کردنەکە بە پوچەڵ بونی کارو کردەوەکانیان بە قبوڵ نەکردنێتی، دیـارە بۆیە قبوڵیش ناکرێت، چونکە پێچەوانەی شایەتمانەکەیەو بۆ خـوا نـەبوە، ئەمـەش هاوشانی پاشگەز بونەوەیە لە ئایین، لە جێیەکی تریشدا دەفەرموێ:

• ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَـٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ﴾البقرة /۲۱۷ واتە: هەر کەسێکتان لە ئایینەکەی پاشگەز ببێتەوەو ئاوا بمرێت، ئەوە بە کافری مردوەو هەمو ئەو کارو کردەوانەشی ـ، کە کردبونی ـ پوچەڵ دەبێتەوەو لای خوای گەورە هیچ نرخێکی نابێت، ئەوانە دوایی، کە دەچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە، بە نەمری هەتا هەتایە تێیدا دەمێننەوە.

جا ئەگەر دواندنی پێغەمبەرﷺو بانگ کردنی بە دەنگی بەرز ببێتە مایەی پوچەڵ بونەوەی کارو کردەوەی موسوڵمان و بیخاتە ڕیزی ئەو کەسانەوە، کە مورتەد بونەتەوە! ئەدی حوکمی کارێکی لەو دژوارتر، دەبێت چی بێت ؟! دەبێت حوکمی گاڵتە پێ کردنی چی بێت ؟! وەکو ئەو نەفرین لێکراوانە شایانی کوشتنن، کە بەتەوسەوە دەڵێن محمد خاوەنی نۆ ژن بوە!

حوکمی ئەم خاڵە زۆر لایەنی تر دەگرێتەوە، وەك ئەو کەسانەی، کە باسی پێغەمبەرﷺ لە نوسینەکانیاندا بە خراپی دەکەن، هەر وەکو باسی کابرایەکی ئاسایی نەناس بکەن! ئەو مورتەدانەی بە ناوی زانستی و شیکردنەوەی مێژو هەڵسەنگاندنەوە دەیانەوێت تانەو تەشەر لە پێغەمبەری خۆشەویستی خواو سەروەری ئەهلی ئیسلام بدەن... خوای پەروەدگارو کارزان جوانی فەرموە، کە دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ جَعَلْنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوًّا شَيَاطِينَ الْإِنسِ وَالْجِنِّ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ۚ وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُ ۖ فَذَرْهُمْ وَمَا يَفْتَرُونَ ﴿١١٢﴾ وَلِتَصْغَىٰ إِلَيْهِ أَفْئِدَةُ الَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ وَلِيَرْضَوْهُ وَلِيَقْتَرِفُوا مَا هُم مُّقْتَرِفُونَ﴾الانعام/١١٢-١١٣ واتە: هەر بەو شێوەیە بۆ هەمو پێغەمبەرێك دوژمنمان لە مرۆڤ و شەیتانان دیاری کردوە، کە لە ناو خۆیاندا ڕاو بۆچون دەگۆڕنەوەو ئاماژەی پلان و پیلان بۆ یەکتر دەکەن و، قسەی باق و بریق و زل زل بۆ مەغرور کردنی یەکتری دەکەن! ئەگەر پەروەردگاری تۆ بیوویستایە هەمو پلان و پیلانێکی ئەوانەی لەو پێغەمبەرانە دور دەخستەوە، بەڵام لێیان گەڕێ، با هەر ئاوا درۆو دەلەسە هەڵبەستن، با کافرەکانیش ـ ئەوانەی باوەڕیان بە ڕۆژی دوایی نییە ـ گوێی دڵی خۆیانیان بۆ هەڵخەن! با دڵیان پێیان بکرێتەوەو

ڕازیان کەن، لێیان گەڕێ، با چ تاوانێك هەیە بیکەن و، کام خراپەیان لە دەست دێت، با قسور نەکەن...

١٤ــ دڵ گوشران و ناڕەحەت بون لە یەکخواپەرستی و باس کردنی و دڵشاد بون بە باسی کوفرو بێ دینی! چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَحْدَهُ ٱشْمَأَزَّتْ قُلُوبُ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۖ وَإِذَا ذُكِرَ ٱلَّذِينَ مِن دُونِهِۦٓ إِذَا هُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴾ الزمر/٤٥ واتە: کە باسی خوای تاك و تەنها دەکرێت، ئەوانەی بێ باوەڕن، دڵیان دەگوشرێت و پێی ناڕەحەت دەبن!! کەچی، کە باسی بت و بتپەرستی دەکرێت، دڵشاد و خۆشحاڵ دەبن... نمونەی وا لە ناو خەڵکیدا زۆر دەبینرێت، بۆ نمونە: ئەگەر هۆی سەرکەوتنی ئیش و کارو سەرکەوتنەکان بگێڕرێنەوە بۆ تواناودەسەلاتی خوای گەورە، دڵیان تەنگ دەبێت، پێیان ناخۆشە وا لێك بدرێتەوە، گەر بیشیگێڕنەوە بۆ سروشت و باروزروف و... هتد، دڵخۆش دەبن! ئەگەر بڵێیت هۆی بەزین و تێکشکانی موسوڵمانان ئەوەیە، کە ئێمە زۆر شارەزای نەخشەو پلانی ململانێی نوێ نەبووین، پێیان خۆشە، کەچی، کە دەڵێیت: ئیرادەی خوا وا بو، کە بە تێکشکان تاقیمان کاتەوە، یان چونکە گوناهمان زۆرەو تۆبەی تەواومان لێیان نەکردوە، لچ هەڵ دەقورچێنن و ڕو گرژ دەکەن، کە دەڵێیت: هۆی سەرکەوتنمان باش خۆ ئامادە کردن و ئازایەتی و خۆگرتنی خۆمانە، ئاسودەیی دەردەبڕن، کەچی هەر بەوەندەی بڵێیت: سەرکەوتنەکەمان لەلایەن خوای گەورەوەیەو ئەو بە لوتفی خۆی پێی بەخشیوین، مڕومۆچ دەبن و نکوڵی لێ دەکەن...، کە پێیان دەڵێیت: با هەمیشە نییەتمان بۆ خوای گەورە ساغ کەینەوەو نیازمان ڕەزامەندی ئەو بێت، پێیان ناخۆش دەبێت، کەچی، کە باسی هەواو هەوەس و نەوس و نەفس و هەڵپەو چڵێسیان بۆ دەکەیت، شاگەشکە دەبن.

١٥ ـ ووتن و باوەڕ کردن بەوەی، کە ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەرﷺ مانای تری ناوەکیان هەیە: واتە جگە لە مانای زاهیری مانای تری (باطني) یان هەیە! واتە: گوایە ئەم ئایەتانەی قورئان و ئەم حەدیسانە مانای تریان لە خۆ گرتوەو، کە تەنها ئەو کەسانە تێیان دەگەن، کە خوای گەورە ئیلهامی پێ بەخشیون و بە دەردی خۆیان دەڵێن، ئەوانەی (عیلمی لەدوننی) یان هەیە! ئەمەش پێچەوانەی شایەتمانە و کوفرە،چونکە خوای گەورە دەفەرموێ:﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا لَّعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴾ یوسف/٢ واتە: ئێمە قورئانمان بە زمانی عەرەبی ناردۆتە خوارەوە تا پەی پێ ببەن و ئەقڵتان پێی بشکێت...

• ﴿ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ مُّبِينٌ ﴾النحل/١٠٣ واتە: زمانی ئەو کەسەی ئەم قورئانەی دەدەنە پاڵ[1] زمانێکی بێگانەیە! خۆ زمانی قورئان، زمانی ڕەوانبێژی عەرەبییە.

• ﴿وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ۚ وَلَئِنِ ٱتَّبَعْتَ أَهْوَآءَهُم بَعْدَمَا جَآءَكَ مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن وَلِىٍّ وَلَا وَاقٍ ﴾ الرعد/٣٧ واتە: هەروەها قورئانێکی عەرەبیمان بۆ ناردیت تا شوێنی بکەویت، خۆ ئەگەر شوێن هەواو هەوەسی ئەوان (کافرەکان) بکەویت ـ دوای ئەوەی ڕێبازی خواویستیت بۆ ڕوون کرایەوەو ناسیت ـ لە ڕیزی ئیسلامەتی دەردەچیت و کەسیش نابێت لە لای خوای گەورە پشتیوانیت لێ بکات! کەسیش ناتوانێت لە سزای ئەو بتپارێزێت...

---

١ ـ ئەهلی جاهیلییەتی قوڕەیش دەیانوت: ئەو کەسەی ئەم قورئانە بە محمدﷺ دەڵێت، کابرایەکی ڕۆمیە، کە ناوی (جەبر الرومی) یە!(و).

زمانی عەرەبی ئاشکرایەو وشەکانی ناسراون و تۆمار کراون، ڕێزمانەکەشی نوسراوەتەوە، ناشکرێ کەسێك بتوانێت قورئان تەفسیر بکات، بێ ئەوەی شارەزایی لە وشەو ڕستەو زمانی عەرەبیدا هەبێت، هەر کەسێکیش بە غەیری ڕێسای زمانی عەرەبی، قورئان لێکداتەوە، لێی وەرناگیرێت و بەو کارەشی کافر دەبێت، جا هەر کەس بێت و بە مانای ناوەکی قورئان لێك داتەوە، قورئان چی بەسەر چییەوە دەمێنێت ؟! ئەوجا پێوەر چی دەبێت بۆ جیاکردنەوەی هەڵەو ڕاستی ئەو جۆرە تەفسیرانە ؟! خۆ ئەو کاتە موسوڵمانان دە ئەوەندەی دیان و جولەکە، ئایینەکەیان لێ دەشێوێت و سەد ئەوەندەی ئەوان، لەت و پەت دەبن و پەرتەوازە دەکەون! لەم ڕوانگەشەوەیە، کە دەبێت بزانین دوژمنایەتی کردنی زمانی عەربی و بەرهەڵستی کردنی عەربی پەتی (فوسحا)، نەك هەر لادانە لە ئیسلام، بەڵکو ڕیشەکێش کردنی خودی ئیسلامەکەیە... چونکە قورئان ئەو کتێبەیە، کە عەلی کوڕی ئەبو تالیب ﷺ دەفەرموێ، کە پێغەمبەر ﷺ ئاوا باسی قورئانی فەرموە: ((كتابُ اللهِ، فيهِ نَبأُ مَا قَبْلكُمْ، وخَبَرُ مَا بَعدِكُمْ، وحُكْمِ ما بينِكم، وهو الفَصْلُ ليسَ بالهَزْلِ، مَنْ تَركَهُ مِنْ جَبَّارٍ قَصَمَهُ اللهُ، ومَن ابْتَغى الهُدَى في غَيرِهِ أضَلَّهُ اللهُ، وهوَ حَبْلُ اللهِ المتينُ، وهو الذِّكْرُ الحكيمُ، وهو الصِّراطُ المستقيمُ، وهو الذي لا تَزيغُ بِهِ الأهواءُ، ولا تَلْتَبِسُ بِهِ الألْسِنَةُ، ولا يَشْبَعُ منه العلماءُ، ولا يَخْلَقُ علَى كثرةِ الرَّدِّ، ولا تَنْقَضي عَجَائِبُهُ، وهُوَ الذي لَمْ تَنْتَهِ اليهِ الجِنُّ إذْ سَمِعَتْهُ حتَّى قالوا: (إنَّا سَمِعْنَا قُرآناً عَجَباً يَهدِي الى الرُّشْدِ فآمَنَّا بِهِ) مَنْ قَالَ بِهِ صَدَقَ، ومَنْ عَمِلَ بهِ أُجِرَ، ومَنْ حَكَمَ بِهِ عَدَلَ، ومَنْ دَعَا اليهِ هُدِيَ الى صِراطٍ مُسْتَقِيمٍ)) رواه الترمذي[1] واتە: قورئان

---

١ـ اخرجه الترمذي و الدارمي و احمد، بەڵام شێخی ئەلبانی بە زەعیفی داناوە لە کتێبی (ضعيف سنن الترمذي ژمارە ٥٥٤) هەندێك زانای تر فەرموویانە ئەمە فەرمایشتی عەلی کوڕی ئەبو تالیب خۆیەتی، بە هەر حاڵ خۆ گومانی تێدا نییە، کە ئەوە هەموی وەسفی قورئانەو حەقە(و) .

کتێبی خوایە باسی ئەوانەی پێش خۆتان و هەواڵی ئەوانەی دوای خۆتان و دەستوری حوکم کردنی خۆتانی تێدایە، ڕاکانی قورئان بنبڕ (قەتعی)ن هەوانتەو گاڵتەجاڕ نین، هەر دەسەڵاتدارێك پشتی تێ کا؛ خوا پشتی دەشکێنێت، هەر کەسێکیش ڕێنماییەکانی وەرگرێت، هەواو هەوەس سەرگەردانی ناکات، هیچ زمانێك ناتوانێت وەك ئەو داڕێژێت، هەر قورئانە، کە زانایان لێی تێر نابن، هەرچەند بەرپەرچ بدرێتەوەو بە درۆ بخرێتەوە سوك نابێت، سەرسوڕهێنەرەکانی ناوی تەواو نابن، هەر ئەو قورئانەیە، کە پەریەکان لە ناو خۆیاندا بە یەکتریان دەوت: گوێمان لە قورئانێکی سەیر بوو، کە ڕێنمایی بەرەو چاکەخوازی دەکات، ئێمەش باوەڕمان پێی هێناوەو شوێنی کەوتوین، هەر کەس قسە بە قورئان بکات، ڕاستگۆ دەردەچێت، ئەوی جێ بەجێی بکات؛ پاداشت وەردەگرێت، ئەوی حوکمی پێ بکات؛ دادپەروەر دەبێت، ئەوی خەڵکی بانگ بکات بۆ لای؛ مانای وایە خەڵکی خستۆتە سەر ڕێی خواویستی...

١٦ـ نەناسینی خوا بەشێوەیەکی ڕاست و دروست، یان ئینکار کردنی یەکێك لە سیفەتەکانی، یان ناوە پیرۆزەکانی، یان کردەوەکانی. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَـٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾ الاعراف/١٨٠ واتە: خوا چەندین ناوی پیرۆزی هەیە، بەو ناوانە هانای بۆ بهێنن و، لێی بپاڕێنەوە، واز لەو کەسانە بهێنن، کە لە ماناو ناوەڕۆکی ناوەکانی خوا لایانداوەو نادروست لێکی دەدەنەوە...

● ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ﴾طـە/٨ واتە: خوا ئەو تەنها پەرستراوەیە، کە بە حەق شایانی پەرستنە و هیچ لە شێوەی ئەو نییە و، چەندین ناوی پیرۆزی هەیە.

• ﴿قُلِ ٱدۡعُواْ ٱللَّهَ أَوِ ٱدۡعُواْ ٱلرَّحۡمَٰنَۖ أَيّٗا مَّا تَدۡعُواْ فَلَهُ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ﴾الاسراء/١١٠
واتە: چ هاواری (الله) بکەن، چ هاواری (الرحمن) بکەن، هەر یەکە، خوا چەندین ناوی پیرۆزی هەیە[١].

•﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ﴾الشوری/١١ واتە: هیچ شتێك وەکو خوا نییە، ئەو خۆی بینەرو بیسەرە.

• ﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ﴾الاخلاص واتە: بلێ: ئەوە خوای تاك و تەنها. ئەو خوایەی جێی نیازو ئومێدە. هانای بۆ دەبرێت ، کەسی لێ نەبوەو لەکەس نەبوە. کەسیش هاوتاو هاوشێوەو هاوجۆری ئەو نییە ..

• ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمۡ زَيۡغٞ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَٰبَهَ مِنۡهُ ٱبۡتِغَآءَ ٱلۡفِتۡنَةِ وَٱبۡتِغَآءَ تَأۡوِيلِهِۦۖ وَمَا يَعۡلَمُ تَأۡوِيلَهُۥٓ إِلَّا ٱللَّهُۗ وَٱلرَّٰسِخُونَ فِي ٱلۡعِلۡمِ يَقُولُونَ ءَامَنَّا بِهِۦ كُلّٞ مِّنۡ عِندِ رَبِّنَاۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّآ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٧ رَبَّنَا لَا تُزِغۡ قُلُوبَنَا بَعۡدَ إِذۡ هَدَيۡتَنَا وَهَبۡ لَنَا مِن لَّدُنكَ رَحۡمَةًۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡوَهَّابُ﴾آل عمران/٧ واتە: خوایە، کە قورئانی بۆ ناردویتە خوارەوە، کە ئایەتی وای تێدایە موحکەمن (بەڵگەو نیشانەکانی ئاشکران و هەمو کەس تێیان دەگات) هەروەها ئایاتی تریش، کە موتەشابیهاتن (وەکو باسی نادیارو چۆنیەتی سیفاتی خواو... هتد) ئەو موسوڵمانانەی، کە باوەڕیان بە خوا هەیە تەسلیمی دەبن و باوەڕی پێ دەهێنن، چونکە دەزانن لە خواوە هاتوە، بەڵام ئەو کەسانەی،

---

١ ـ ئەم ئایەتە بەرپەرچی ئەبو جەهل بوو، کە دەیوت: محمدﷺ خۆشی نازانێت خواکەی کامەیە، جارێك دەڵێ: ناوی (الله) یە وجارێکی تر دەڵێ: ناوی (الرحمن)ە!!

کە گوماناوی و دوو دڵ و ڕاڕان هەوڵ دەدەن دەمەوەری لەو ئایەتە موتەشابیهاتانەدا بکەن، بەو هیوایەی موسوڵمانان بە شەڕە قسەو ئاشوب و شتی بێ سودەوە خەریك بکەن، گوایە ئەوانیش هەر قورئانەکە تەفسیر دەکەن! بەڵام خۆ خوای گەورە دەزانێت لێکدانەوەی چۆنە، زانا شارەزاکانیش دەڵێن: باوەڕمان بەوانە هەموی هێناوە، چونکە لە لایەن خوای پەروەردگارمانەوە هاتوە. بەڵام جگە لە خاوەن ژیرییەکان کەس ئەو پەندو ئامۆژگاریانە وەرناگرێت. دەسا خوایە، دوای ئەوەی ڕێنماییت کردین بۆ ڕێبازەکەی خۆت و بۆ شوێن کەوتن و پێوە پابەند بونی، دلیشمان لەسەر خۆشەویستی ڕێبازەکە سارد مەکەرەوە، بە ڕەحمەتی خۆت دابین بون و جێگیریمان پێ ببەخشە، چونکە بەڕاستی هەر جەنابت ڕێنمایی ڕەحمەت دەبەخشیت...

• ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء﴾ الحج/٦٣ واتە: مەگەر نابینیت، کە ئاوا خوا بارانی لە ئاسمانەوە باراندوە ؟! ..

ـ لەسەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیمیش ـ سەلامی خوای لێ بێت ـ دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّذِى هُوَ يُطْعِمُنِى وَيَسْقِينِ ﴿٧٩﴾ وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ ﴿٨٠﴾ وَٱلَّذِى يُمِيتُنِى ثُمَّ يُحْيِينِ ﴾ الشعراء/٧٩ـ٨٠ واتە: خوای پەروەردگاری من ئەوەیە، کە خواردن و خواردنەوەی پێ بەخشیوم، ڕۆزیم دەدات، ئەگەر نەخۆشیش کەوتم چاکم دەکاتەوە، هەر ئەویشە دەمرێنێت و زیندوم دەکاتەوە ..

• ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيْلِ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ﴾الانعام/٦٠ واتە: هەر خوایە، کە بەشەوان دەتانمرێنێت و هەمو ئەوانەش دەزانێت، کە بە ڕۆژ کردوتانە...

• ﴿وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ﴾ الانفال/١٧ واتە: ئەی محمد، تۆ ئەو چنگە خۆڵەی گرتە چاوی کافرەکان، تۆ نەت هاوێشت، بەڵکو خوا بوو، کە هاوێشتی و گەیاندییە دەم و چاوی هەموو کافرەکان[١].

• ﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيْءٍ﴾ الزمر/٦٢ خوا کردگاری هەموو شتێکە.

• ﴿لا حولَ ولا قوةَ إلا باللهِ﴾[٢] لە تەسبیحاتی بەردەوامی پێغەمبەرﷺ بوو واتە: هیچ جۆرە تواناویەك و هیچ جۆرە هێزێك نییە، مەگەر ئەوەی، کە خوای پەروەردگار داوێتی ...

• یان لەسەر زمانی موسا دەفەرموێ: ﴿إِنْ هِيَ إِلَّا فِتْنَتُكَ تُضِلُّ بِهَا مَن تَشَآءُ وَتَهْدِي مَن تَشَآءُ﴾ الاعراف/١٥٥ واتە: خوایە ئەمە تاقی کردنەوەی خۆتە، تا ئەوە بسەلمێت، کە کێ حەزی لە گومڕاییەو کێش ڕێنمایی خوا وەردەگرێت...

ئیمامی بوخاری و موسلیم گێڕاویانەتەوە، کە ((عن زيد بن خالد الجهني رضي الله عنه قال: صلَّى بِنَا رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلمصلاةَ الصُّبْحِ بالحُدَيبيَّةِ في إثْرِ السَّمَاءِ كانتْ مِنَ الليلِ، فَلَمَّا انْصَرَفَ أقْبَلَ عَلَى النَّاسِ فقالَ: هَلْ تَدْرونَ ماذا

---

١ ـ ئیبنو عەبباس ـ خوا لێیان ڕازی بێت ـ دەفەرموێ: پێغەمبەرﷺ لە غەزای بەدردا چنگێك خۆڵی هەڵگرت و وەشاندییە کافرەکان و فەرمویێ: (شاهت الوجوه) کەس نەما لە کافرەکان بەر چاوو لوتی نەکەوتبێت. بڕوانە سيرة ابن هشام / عبدالسلام هارون لا ١٣٩ و فقه السيرة/ محمد سعيد رمضان البوطي لا ٢١٧ ئەم ئایەتەش ئاماژەیە بۆ ئەو ڕوداوە(و)

٢ ـ عن أبي موسى الأشعري رضي الله عنه قال: قال لي النبي صلى الله عليه وسلم:" ألا أدلك على كنز من كنوز الجنة ؟ فقلت: "بلى، يا رسول الله، قال: لا حول ولا قوة إلا بالله) متفق عليه.(و).

قالَ ربُّكُمْ ؟ قالوا: اللهُ ورسولُهُ أعلَمُ قـال: قـالَ: أصـبحَ مِـنْ عبـادِي مُـؤمِنٌ بـي وكافِرٌ، فأمَّا مَنْ قالَ: مُطِرْنا بِفَضْلِ اللهِ ورحْمَتِهِ فَذلكَ مُـؤمِنٌ بـي كـافِرٌ بالكَوكَـبِ، وأمَّا مَنْ قالَ: مُطِرْنا بِنَوءِ كَذا وكَـذا فَـذلكَ كـافِرٌ بـي مـؤمِنٌ بالكَوكَـبِ))[1] واتـە: زەیدی کوڕی خالد(ﷺ) فەرموی: جارێك پێغەمبەرﷺلە حودەیبییە نوێژی بەیانی پێ کردین، شەو بـاران بـاریبوو، پـاش ئـەوەی لـە نوێـژ تـەواو بـوو، ڕوی کـردە خەڵکەکەو فەرموی: ئایا دەزانن، کە خوا چی فەرموە ؟! ووتیان: خواو پێغەمبەری خوا دەزانن، فەرموی: هەندێك کەس لە بەندەکانم کافر بون و، هەنـدێکی تریـشیان موسوڵمان، ئەوی، کە ووتی لە فەزڵ و ڕەحمـەتی خـواوە بارانمـان بـۆ بـاری، ئـەوە باوەڕی بە من هێناوەو کوفرانەی بە ئەستێرە کردوە، ئەو کەسەش، کـە ووتـی: بـە ئاوا بونی فڵان ئەستێرە بارانمان بۆ باریوە، ئەوە کوفرانەی بە من کـردوە و بـاوەڕی بە ئەستێرە هێناوە.[2]

کەوا بو ئەو کەسەی، کە هەرچی لە بونەوەردایە بە کاری خوای نەزانێت، مانای وایە خوای نەناسیوە، ئەو کەسەی کەم و کورتییەکی خستە پاڵ خوای گەورە، ئـەوە خوای نەناسیوە، ئەو کەسەی ناوو سیفەتەکانی خوای نەزانیوە، مانای وایـە خـوای نەناسیوە... ئەو کەسەی قەناعەتی تەواوی وا نەبێت، کە خوای گەورە تەواوی بـێ سنورە، خوای نەناسیوە، ئەوی خواشی نەناسیوە کـافرە ..خـوا دەفـەرموێ: ﴿مَـا قَدَرُوا اللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِ إِنَّ اللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيـزٌ﴾ الحـج/٧٤ واتـە: کافرەکـان بەڕاسـتی وەك

---

١ ـ ئیمامی بوخاری لە الأذان، باب: یستقبل الإمام الناس إڎا سـلم (٨٤٦)، ومـسلم لـە الإیمان(٧١).

٢ ـ عەرەبەکان لە زەمانی جاهیلییەتی پێـشودا باوەڕیـان وا بـوو، کـە ئـاوا بـونی فـڵان ئەستێرە دەبێتە هۆی باران بارین! خوای گەورەش لەم حەدیسە قودسیەدا وای دیـاری کـردوە، کە ئەو باوەڕە، کوفرەو پێچەوانەی شایەتمانە... (و).

پێویستە، ڕێزو قەدری خوایان نەگرت، چونکە هاوەڵیان بۆ پەیدا کردوە، خواش بەهێزو بەڕێزو خاوەن دەسەڵاتە... هەروەها دەفەرموێ: ﴿وَمَا قَدَرُوا۟ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦٓ إِذْ قَالُوا۟ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٍ مِّن شَىْءٍ﴾ الانعام /٩١ واتە: کافرەکان بە ڕاستی قەدری خوایان ـ وەکو، کە پێویست بوو ـ نەگرت، چونکە دەیانوت خوا وەحی خۆی بۆ هیچ مرۆڤێك نەناردوە...

دیانەکان بەوە کافر بون، کە (پەنا بە خوا) دەیان ووت: عیسا کوڕی خوایە، جولەکەکانیش کافر بون، چونکە (پەنا بە خوا) دەیان ووت: خوا ڕەزیلە! یان دەیان ووت، کە خوا بونەوەری دروست کرد ماندو بوو، دوایی حەسایەوە!! خوای گەورە دەفەرموێ :﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾المائدة/٧٢ واتە: بە تەئکید ئەو کەسانە کافر بون، کە ووتیان خوا هەر عیسای کوڕی مەریەمە! ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ﴾المائدة/٧٣ واتە: ئەوانەی، کە دەیانووت خوا سێیەمی سێ خواکەیە، کافر بون.

●﴿ وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴾ مریم/٨٨ـ٩٣ واتە: دەیانوت: خوا کوڕێکی بۆ خۆی داناوە، ئەمە بە ڕاستی ناماقوڵییە، خەریکە ئاسمانەکان لە ناقۆڵایی ئەو قسەدا داکەون و زەوی شەق بەرێت و بە خۆدا ڕۆچێت، چیاکانیش خەریکە وردو خاش بن! لە تاوی

ئەو قسە دڕوارەی، کە دەڵێن خوا کوڕێکی هەیە. ئاخر ناشێت و ناکرێت خوا کوڕی هەبێت، چونکە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەمینداں، هەر هەمو بە کۆیلەیی و بەندایەتی دێنەوە بەر دەستی خوا...

ئەوجولەکانەش کافر بون، کە دەیانوت: ﴿ لَّقَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ ﴾ آل عمران/١٨١ واتە: خوا قسەی ئەوانەی بیست (ناوی فەنحاس بوو)، کە دەیانوت: خوا دستکورتەو هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین! ئەوانی تریشیان، کە دەیانووت:﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ۚ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾ المائدة/٦٤ واتە: جولەکەکان دەیانوت: دەستی خوا لە عاستی خێرەومەندیدا نوقاوەو ڕەزیلە! دەك ئیفلیج بن، دەی مادام وا دەڵێن لەعنەتی خوایان لێ بێت، خۆ خوای گەورە هەردوو دەستی کراوەن. هەروەها لە ڕەددیاندا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴾ ق/٣٨ واتە: هەمو ئاسمانەکان و زەویان بە شەش ڕۆژ دروست کردووە هیچ تینێکی ماندو بونیشمان پێ نەگەیشتوە.

نەناسینی تەواوی خوای گەورە، یان وەسف کردنی بە سیفەتێك، بە شتێك، کە لەو نەوەشێتەوە، یان شوبهاندنی بە یەکێك لە مەخلوقات، یان ناساندنی مەخلوقێك بەو، یان بە سیفەتێکی ئەو، یان وەسف کردنی مەخلوقێك بە یەکێك لە سیفەتەکانی ئەو... ئەمانە هەموویان پێچەوانەی شایەتمانەکەن و کوفرن، چونکە ئەوەیان لێ دەفامرێتەوە، کە خوایەتییەکە دراوە بە کەسێك، یان بە شتێکی تر، کە شایانی نییە، ئەو کەسەی خوا ناناسێت، ناشزانێت خوایەتی چییە، ئەوی

خوایەتیش نەزانێت، خوا بە یەك دانانێت، ئەوی خواشی بەیەك دانەنا، مانای وایە وەحیەکانی خوای مەزنی بە درۆ خستۆتەوە...

١٧ ـ نەناسینی پێغەمبەرﷺبەو شێوە ڕاست و دروستەی، کە ئیسلام داوای کردوە، هەروەها داماڵینی سیفەتێکی لەوانەی، کە خوای گەورە باسی فەرمون، یان باس کردنی پێغەمبەرﷺبە شێوەو شێوازێك، کە لە ڕێزی کەم کاتەوە، هەوەرها تیرو توانج تێگرتن، یان دان نەنانی بەوەی، کە هەر ئەو پێشەوای مرۆڤایەتییە... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الاحزاب/٢١ واتە: بەڕاستی لە پێغەمبەردا ﷺچاکترین نمونەتان بۆ شوێن کەوتن هەیە.

● ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾ قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾ ال عمران/٣١ـ٣٢ واتە: بڵێ: ئەگەر ڕاست دەکەن و خواتان خۆش دەوێت، وەرن شوێن من کەون، تا خوا خۆشی بوێن ئەو کاتە لە گوناهەکانیشتان خۆش دەبێت، چونکە خوا لێبوردەو میهرەبانە. گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەر بکەن، ئەگەر سەرپێچییان کرد و گوێیان نەدایێ لێ گەڕێ، کە خوا کافرانی خۆش ناوێت.

● ﴿ نٓ ۚ وَٱلْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ ﴿١﴾ مَآ أَنتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِمَجْنُونٍ ﴿٢﴾ وَإِنَّ لَكَ لَأَجْرًا غَيْرَ مَمْنُونٍ ﴿٣﴾ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾ فَسَتُبْصِرُ وَيُبْصِرُونَ ﴿٥﴾ بِأَييِّكُمُ ٱلْمَفْتُونُ ﴿٦﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴾القلم/١ـ٨ واتە: سوێند بە پێنوس، بەوەی دێڕ بە دێڕ دەنوسرێت. تۆ بە هۆی نازو نیعمەتی

خواییەوە شێت نیت. تۆ پاداشتی نەبڕاوەت هەیە. بەڕاستی تۆ ڕەوشت بەرزیت و لە سەرو ڕەوشتی مەزنەوەیت. سەرەنجام تۆش دەیبینیت و ئەوانیش دەیبینن. ئەو شێتێتیە بە کامتانەوەیە. پەروەردگارت خۆی دەزانێت کێ لە ڕێبازی ئەو لایداوەوگومڕابووەو، کێش ڕێبازی هیدایەتی ئەوی گرتۆتە بەرو ڕێنمایی کراوە.

● ﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَيُزْلِقُونَكَ بِأَبْصَـٰرِهِمْ لَمَّا سَمِعُوا۟ ٱلذِّكْرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجْنُونٌ﴾القلم /٥١ واتە: کافرەکان لە حەسودی خۆیاندا کەوتونەتە پێدا هەڵشاخانت، بە چاوی بەدو پیسییان بەغیلیت پێ دەبەن، وا بڵاو دەکەنەوە، کە شێتە!

●﴿وَلَـٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ﴾ الاحزاب/٤٠ بەلام نێرراوی خواو کۆتا پێغەمبەرە .

هەر کەسێك لە پێغەمبەرێتیدا شوێنی کەسێکی تری (غەیری پێغەمبەران) بکەوێت، کافر دەبێت، هەر کەسێکیش بلێت محمد ﷺپێغەمبەری عەرەبەو بەس نەك هی گەلانی تر، کافر دەبێت، چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ﴾الانبیاء/١٠٧ واتە: ئێمە بۆ ئەوە تۆمان کردە پێغەمبەر، تا ڕەحمەت و بەزەیی بیت بۆ هەموو جیهانیان. یان دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَـٰكَ إِلَّا كَآفَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيرًا وَنَـذِيرًا ﴾سبأ/٢٨ واتە: ئێمە، کە تۆمان کردوە بە مژدە دەرو هۆشدەر، بۆ هەمو خەلکیمان ناردویت.

هەر کەسێك بۆ کەم کردنەوەی ڕێزی پێغەمبەر ﷺبلێت: ئەو محمدە دەشتەکییە بەدەویە، کافر دەبێت .

ئەم بڕگەش لقی تری زۆری لێ دەبێتەوە...

١٨ـ بە کافر دانانی موسوڵمان و بەکافر دانەنانی کافر و، بە حەڵاڵ زانینی کوشتاری موسوڵمانان، چونکە ڕێسای ئیسلامی دەفەرموێ: (ئەوی موسوڵمانێك بە کافر بزانێت کافرە، ئەوی کافر بە کافر نەزانێت کافرە، ئەوی گومانی لە کافرێتی کافر هەبێت کافرە).

پێغەمبەریش ﷺدەفەرموێ: ((لا يَرْمِي رَجُلٌ رَجُلاً بِالفِسْقِ أو الكُفْرِ إلا ارْتَدَّتْ عَلَيهِ إنْ لَمْ يَكُنْ صَاحِبُهُ كَذلِكَ) رواه البخاري ومسلم هەروەها دەفەرموێ: ((سِبَابُ المُسْلِمِ فُسُوقٌ وقِتالُـهُ كُفْـرٌ)) واتـە: جنێـودان بـە موسـوڵمان گونـاحی گەورەیـەو کوشتاریشی کوفرە[1]. یەکێك بە یەکێکیی تر بڵێت فاسق یان کافر، ئەگـەر براکـەی وا نەبوو، ئەوا تۆمەتەکە دەگەڕێتـەوە سـەر بێژەرەکـەی... هـەروەها دەفـەرموێ: ((أخْوَفُ مَا أخافُ علَى أُمَّتِي ثَلاثٌ: رَجُلٌ قَرَأَ كِتَابَ اللهِ حَتَّى اذا رَسَتْ عليهِ بَهْجَتُهُ وكانَ عليهِ رِدْءُ الاسلامِ اِخْتَرَطَ سَيفَهُ وَضَرَبَ بِهِ جارَهُ ورَمَاهُ بِالشِّرْكِ. قِيلَ يا رسُولَ اللهِ الرامي أحَقُّ بِهِ أمْ المَرمِي ؟ قال: الرامي))[2]واتە: گەورە ترین شـتێك، کـە لێی دەترسم نەتەوەکەمی تێ کەوێت سێ شتە: کابرایەك قورئان بخوێنێت، تـا لێـی شارەزا دەبێت و چێژی لێ دەکات و سیمای ڕێزی ئیسلامی دەکەوێتە سەر، ئینجا بە شمشێرێکەوە هەستێت بۆ دراوسێکەی وـ دوای ئەوەی تاوانی شیرکی دایە پاڵی ـ

---

١ ـ کوفر دوو جۆرە: کوفری گەورە: ئەو گوناحەیە، کە خاوەنەکەی لـە ئیـسلام و ئوممـەتی دەباتــە دەرەوە. کــوفری بــچوکیش: ئەوەیــە، کــە خاوەنەکــەی لــە ئیــسلام و ئوممەتەکــەی ناباتەدەرەوە...(و)

٢ ـ نوسەری ڕەحمەتی خۆی دەربارەی ئـەم حەدیـسە نوسـیوێتی: رواه الطبراني في الكبير والصغير باسناد فيه لين!! واتە زەعیفە، مادام حەدیسی بوخاری و موسلیم لەم بارەوە هـەبێت ـ وا بزانم ـ پێویست بە حەدیسی ناوا لاواز ناکات. ئـەوە بـۆ حاڵـەتێك باشـە هیـچی ترمـان نەبێت... (و) .

بیکوژێت ووتیان ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوی شمشێرەکە دەوەشێنیت شایانی حوکمی شیرکە، یان ئەوی شمشێرەکەی لێ دەدرێت؟ فەرمووی: ئەوی دەیوەشێنێت...

بە کافر دانانی موسوڵمان بۆیە پێچەوانەی شایەتمانەو کوفرە، چونکە تانە دانە لە خودی باوەڕ، تۆمەتبار کردنی ئیمانی کابرایە...

جا هەر وەکو، کە گومان کردن لە کافرێتی کافر کوفرە، یان بە کافر دانەنانی کافر کافر بونە، چونکە بە درۆخستنەوەی خواو پێغەمبەری خوایەﷺ، ئەم باسەش زۆر قووڵەو لق و چڵی زۆری لێ بۆتەوە، بۆیە ئەو کەسەی، کە حوکمێك لەم بارەوە لەسەر کەسێك دەردەکات، دەبێت خۆی شارەزا بێت، چونکە حوکمی کوفری وا هەیە زانایان لەسەری کۆکن، هی واش هەیە ڕایان لەسەری جیاوازە، دیسان وەکو بینیشمان بە کافر زانینی موسوڵمانیش شتێکی دژوارو گەورەیە...

۱۹ـ ئەنجامدانی کارێك بۆ کەسێك، کە خوای گەورە بە پەرستنی ناساند بێت و بڕیاری بێت، کە نابێت بۆ غەیری خوا ئەنجام بدرێت. وەك سەربڕینی ئاژەڵ و باڵندەو ئەوانە بۆ غەیری خوا.[۱] یان ڕکوع و سوجدە بردن بۆ غەیری خوای گەورە[۲] یان بە دەورەی جێیەکدا بۆ خوا پەرستی و نزیك بوونەوە لە خوای گەورە بخولێتەوە[۳] خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ

---

۱ـ وەك سەربڕینی مەڕێك لە ژێر پێی کەسێکی گەورەدا بۆ پێشوازی و ڕێز لێگرتنی! ئەمە جائیز نییەو شیرکە.(و) .

۲ـ چەمانەوەی پێشوازی و سڵاو کردن و خۆنوشتاندنەوە بۆ ئاڵاو سرودی نیشتمانی و... هتد هەر وایە و هەر هەمان حوکمی هەیە، چونکە بە مەزن دانان و پیرۆزییە(التعظیم و التقدیس)...(و) .

۳- وەکو ئەو گێل و نەفامە موشریکانەی بە دەوەری مەرقەدەکاندا تەواف دەکەن.. (و).

﴿١٦٢﴾ لَا شَرِيكَ لَهُۥ وَبِذَٰلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴾ الانعام/ ١٦٢ـ١٦٣ بلێ: مـن نوێژو پەرستن و ژیان و مردنم هەر بۆ خوای پەروەردگاری جیهانیانە، کـە بـە هـیچ شێوەیەك هاوەڵی نییە.

یان وەك ئەوەی هاناو هاوار بباتە بەر غەیری خواو لێی بپاڕێتەوە (زیندو بێـت، یان مردو) تـا زیـانی لـێ دور خاتـەوەو سـودی پـێ بگـەیێنێت. خـوای گـەورە دەفەرموێ: ﴿ لَهُۥ دَعْوَةُ ٱلْحَقِّ وَٱلَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسْتَجِيبُونَ لَهُم بِشَىْءٍ إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيْهِ إِلَى ٱلْمَآءِ لِيَبْلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ ۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلْكَٰفِرِينَ إِلَّا فِى ضَلَٰلٍ ﴾الرعد/١٤ واتە: بانگەوازی ڕاستی یەکخواپەرستی تەنها بۆ ئەوە، ئەو کەسانەی هانا بۆ غەیری خوا دەبەن، هیچ کەسێك وە دەنگیانەوە نایەت، حاڵی ئەو کەسە وەك ئەو کەسە وایـە، کە تینوەو بە هەمو تینی خۆی دەست دەدەهێڵێتە خوارێ بۆ بیرێك، بەو هیوایـەی دەستی بگاتە ئاوەکەو هەڵی هێنجێت و هەر چۆنێك بێت بیگەیێنێتە دەمی! بەڵام ڕەنجی بێ سودە... ئێ دوعـاو هاناو پاڕانەوەی کافرانیش ئاوایە...

یان ئەوەی سوێند بە غەیری خـوای گـەورە دەخـوات، چـونکە هەمیـشەو لای هەمو کەسێك سوێند پێ خوراو گەورەو بە قەدرە، بەڕێزو پیرۆزە، بۆیە سوێندی پێ دەخورێت، پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((مَنْ حَلَفَ بِغَيرِ اللهِ فَقَدْ أشْرَكَ))رواه الترمذي[١] واتە: هەر کەس بە غەیری خوا سوێند بخوات ئەوە هاوەڵی بـۆ خـوا بڕیـار داوە...

---

١ـ حەدیسی تری سەحیح لەم بارەوە زۆرن هەیانە مەنعی سـوێند خـواردن بـە ئەمانـەت دەکات، هەیانە بە باوك وباپیران، هەشیانە هەر بە گشتی شتی تر وەکو (من حلف بشيء دون الله فقد أشرك)اخرّجه الإمام أحمد رحمه الله عن عمر بن الخطابﷺ بإسناد صحيح، وأخرج أبو داود والترمذي بإسناد صحيح عن عبدالله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما، عـن الـنبي ﷺ أنه قال: (من حلف بغير الله فقد كفر أو أشرك)، وثبت عنـه ﷺ أنـه قـال : (مـن حلف بالأمانة فليس منا)(و).

کەسێك نەزریش بۆ غەیری خوا بگرێتە خۆی هەر وایە، هەر پێچەوانەی شایەتمانەو شیرکە.[١]

یان ئەگەر کەسێك حەج دەکات، بەڵام لە ڕێگایـدا پێـی خواپەرسـتییە ئەگـەر زیارەتی گۆڕی پیاوچاکێکیش بکات!! ئەمەش پێچەوانەی شایەتمانەو شیرکە.

ڕێسایەك لەم بارەوە هەیە، کە دەشێت بکرێتە پێوەر، ئەویش ئەوەیە کە: دەبێت موسوڵمان هەمو کارێکی لەبەر خاتری خوا ئەنجام بدات، هەمو کارێکیشی دەبێـت بە پێی شەریعەتی خوا بێت بۆیە ئەگەر کـارێکی کـرد، کـە خـوای گـەوەر ڕێـی نەدابو، ئەوە کوفر، یان تاوانێکی کردوە.[٢]

٢٠ـ هەروەها چەندین جۆرگوفتارو ڕەفتاری تر هەن، کە دەچنە ڕیزی ئەوانەوە و پێچەوانەی شایەتمانن و هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنن، بـەڵام هـی تـریش هـەن، کـە دەچنە ڕیزی هاوەڵ بۆ خوا پەیدا کردنەوە، بـەڵام شـایەتمان هەڵناوەشـێننەوە، وەك ریا، کە هاوەڵ بۆ خوا دانانە، بەڵام شایەتمانی خاوەنەکـەی هـەڵ ناوەشـێنێتەوە... بۆیە بۆ چارەسەری ڕیا پێغەمبەرﷺدەفەرموێ: ((اللهُمَّ انِّي اعُوذُ بِكَ انْ اُشْـرِكَ بِـكَ شَيئَاً اَعْلَمُهُ واسْتَغْفِرُكَ لِمَا لا اَعْلَمُـهُ)) واتە: خوایە پەنا دەگرم بە تۆ، کە بـە زانـین

---

١ ـ وەکو ئەوەی هەندێ گێلە کورد دەیکـەن، کـە دەڵـێن مـەڕێکم نـەزر بێـت بـۆ شـێخ عبدالقادری گەیلانی، یان بۆ کاك ئەحمەدی شێخ، یان بـۆ شـێخی چـۆلی ونـەبی عوزێرەکـەی هەولێر!! یان ناوساجی سلێمانی بۆ ئیمام عەبباسی تـەعجیل!! یـان لـە بۆکـان بـۆ شـێخی زەمبیل وە!! هەروەها...

٢ـ تاوان و گوناح دوو بەشە: گوناحی کوفری: وەکو حوکم بە غەیری دینی خـوا و سـوجدە بۆ بت و قورئان فڕێدانە ناو پیساییەوە، بکەری ئەمانەش لە ئیسلام دەچێتە دەرەوەو بەهانەشی قبوڵ نییە. گوناحی فیسقی: ئەمەش وەکو گوناحەکانی ترە، بەو مەرجـەی بـە حـەڵاڵ نـەزانرا بێت، وەکو شەراب خواردنەوەو زیناو سو... هتد، ئەمانیش، کە بە حەڵاڵ زانران، دەچنە ڕیزی بەشی یەکەمەوە...(و).

هاوەڵێك بۆ جەنابت پەیدا بكەم، داوای لێبوردنیشت لـێ دەكـەم لـەوەی، كـە بـە نەزانین هاوەڵێكم بۆ پەیدا كردبیت...

شێوەی ئەم هاوەڵ بۆ خوا پەیدا كردنەش زۆرە، وەكو یەكێك نوێـژەكانی زۆر بـە ڕێك و پێك دەكات مادام هەست دەكات وا خەڵكێك تەماشای دەكەن! ئەمە هـەر شیركە و لقێكی سەرەكی خواپەرستی بەتاڵ دەكەنەوە، بەڵام خاوەنەكەی لە ئیـسلام ناباتە دەرەوە، بۆیە پێی دەڵێن: شیركی بچوك .

یان كەسێك خێرو خێراتێك دەكات، وا دەیكات خەڵكی پێی بزانن، تا پێی بڵێن خێرومەندە، یان جیهاد دەكات، بەڵام بۆ ئـەوەی دەكـات بڵـێن ئازایـە، یـان بـۆ یەكێك بیەوێت شت زۆر فێر بێت، تا بكرێتە پێشەواو سـەركردەو فەرمانـدە، یـان وتار بێژ و مەلاو موفتی..[1]

ئیمامی موسلیم گێڕاوێتیەوە، كە پێغەمبەرﷺلە خوای گەورەوە دەگێڕێتـەوە، كە فەرمویەتی: ((انا اغْنَى الـشُّرَكاءِ عِـنْ الـشِّرْكِ ، فَمَـنْ عَمِـلَ عَمَلَـاً اَشْـرَكَ فيـهِ

---

[1] – وادیارە نوسەری ڕەحمەتی ئەم سێ نمونەیەی، كە هێناوێتیەوە (خێرومەندو موجاهیدو قورئان خوێن) لە حەدیسەكەی پێغەمبەرەوەﷺ وەری گرتبێت، كە تێیدا دەفەرموێ: (عن أبي هريرة قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: إن أول الناس يقضى يوم القيامة عليه: رجل استـشهد، فأتى به، فعرفه نعمته فعرفها، قال: فما عملت فيها؟ قال: قاتلت فيك حتـى استـشهدت. قـال: كذبت، ولكنك قاتلت لأن يقال: هو جرئ، فقد قيل، ثم أمر به فسحب على وجهه حتى ألقي في النار، ورجل تعلم العلم وعلمه، وقرأ القرآن، فأتى به، فعرفـه نعمـه فعرفهـا، قـال: فمـا عملـت فيها؟ قال: تعلمت العلم وعلمته، وقرأت فيك القرآن. قال: كذبت، ولكنك تعلمت ليقـال: عـالم، وقرأت القرآن ليقال هو قارئ، فقد قيل، ثم أمر بـه فـسحب علـى وجهـه حتـى ألقـي في النـار، ورجل وسع الله عليه وأعطاه من أصناف المال، فأتى به، فعرفه نعمه فعرفها، قـال: فمـا علمـت فيها؟ قال: ما تركت من سبيل تحب أن ينفق فيها إلا أنفقـت فيهـا لـك، قـال: كـذبت، ولكنـك فعلت ليقال: هو جواد، فقد قيل، ثم أمـر بـه فـسحب علـى وجهـه حتـى ألقـي في النـار" (رواه مسلم والنسائي، ورواه الترمذي وحسنه، وابن حبان في صحيحه، وكلاهما بلفظ واحد).

غَيري، تَرْتُهُ وَشِركَهُ)) واتە: من پێویستیم بە هاوەڵ نییە، هەر کەسێکیش ـ ئەگەر ئیشی کرد ـ وهاوەڵی بۆ من پەیدا کرد، بۆ شیرکەکەی خۆی لێدەگەڕێم، با بڕوات خۆی و هاوەڵەکەی، کە بۆ منی داناوە...

ئیمامی ئەحمەد دەگێڕێتەوە، کە پێغەمبەر ﷺفەرمویەتی: ((ألَا أُخْبِرُكُمْ بَما هو اَخْوَفُ عليكم عِندي مِن المَسيحِ الدَّجَّالِ؟ " قالوا بلَى يا رسولَ اللهِ قال: الشِّرْكُ الخَفِي. يقومُ الرَّجُلُ فيصَلِّي فَيُزَيِّنُ صَلَاتَهُ لِمَا يَرَى مِنْ نَظَرِ الرَّجُلِ اليهِ))واتە: ئەرێ ئەو مەسەلەیەتان پێ نەڵێم، کە لە جەجاڵ زیاتر وام لێدەکات لێتان بترسم لێی؟! وتیان: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا، فەرموی: شیرکی شارراوە، کابرا هەڵدەستێ بۆ نوێژ، بەڵام کە دەبینێت وا یەکێکی تر تەماشای دەکات، نوێژەکەیرێکوپێکتر دەکات!!

هەروەها ئەبو داودو ئەبو ئومامە دە گێڕێنەوە، کە: ((جَاءَ رَجُلٌ فقالَ يا رسولَ اللهِ، أرأيتَ رجُلاً غَزا يَلتَمِسُ الأجْرَ والذكْرَ. مَا لَهُ ؟ قال: صلى الله عليه وسلملا شئَ. فَأعادَها ثَلاثاً، كُلُّ ذلِكَ يَقولُ: لا شَئَ لَهُ. ثُمَّ قالَ: رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلمإنَّ اللهَ لا يَقبَلُ مِنَ العملِ إلا مَا كانَ لهُ خَالِصاً أُبْتُغِيَ بِهِ وَجْهَهُ))[1] واتە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەرﷺو پرسی: ئەگەر کابرایەك بە مەستی دەستکەوتنی پاداشت و ناوبانگ دەرکردن بچێتە غەزا حوکمی چی یە؟ فەرموی: هیچ پاداشتێکی نابێت. کابرا سێ جاری تر پرسیارەکەی کردەوە. بەڵام ئەو هەر دەیفەرمو: هیچ پاداشتێکی نابێت، پاشان فەرموی: خوای پەروەردگار کردەوەیەکی قبوڵە، کە بە تایبەتی لەبەر خاتری ئەو ئەنجام درا بێت.

١ ـ ابو داود ونەسائی لە ابو ئومامەوە (بسندجید) گێڕاویانەتەوە (و).

هەروەها نەسائی لە عوبادەوە دە گێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺفەرموی: ((مَنْ غزَا في سَبيلِ اللهِ ولَمْ يَنْوِ إلّا عِقَالاً فَلَهُ مَا نَوَى))[1] واتە: هەر کەس بەمەبەستی پەتکە گوریسێك جیهاد بکات، پاداشتەکەی هەر لەسەر مەبەستەکەیەتی! یەعنی لەو پەتکە گوریسەی زیاتر پێ نابڕێت.

ئیمامی موسلیم و نەسائی و ترمزی گێڕاویانەتەوە، کە ئەبو هورەیرەﷺ دە گێڕێتەوە، کە پێغەمبەرﷺفەرمووی: ((إنَّ اللهَ اذا كانَ يومَ القيامَةِ يَنْزِلُ الى العِبَادِ لِيَقْضِيَ بَينَهُم وكُلُّ أُمَّةٍ جَاثِيَةٌ فَأوَّلُ مَنْ يَدْعُو بِهِ رَجُلٌ جَمَعَ القُرانَ، و رَجلٌ قُتِلَ فى سبيلِ اللهِ و رَجلٌ كثيرُالمالِ، فَيقولُ اللهُ للقاري: أَلَمْ أُعَلِّمْكَ مَا اَنْزَلْتُ علَى رَسولِى ؟ فَيقولُ بَلَى يا رَبُّ، فيقولُ: مَا عَمِلْتَ فِيما عَلِمْتَ ؟ فيقولُ يا رَبِّ قَرَاْتُهُ فيآنَاءِ الليلِ و اطرافِ النَّهارِ. فيقولُ اللهُ: كَذَبْتَ و يقولُ الملائِكَةُ: كَذَبْتَ و يقولُ اللهُ تعالَى: انَّمَا أَرَدْتَ أَنْ يُقَالَ فُلانٌ قارئٌ فَقَدْ قِيلَ ذلكَ. ويُؤتَى بِصاحِبِ المالِ، فيقولُ اللهُ: اَلَمْ أُوَسِّعْ عَليكَ حَتَّى لَمْ اَدعْكَ تَحْتَاجُ الَى اَحَدٍ، فَيقولُ: بَلَى يا رَبِّ. فيقولُ: فَمَاذا عَمِلْتَ فيما آتَيتُكَ ؟ قالَ: كُنْتُ اَصِلُ الرَّحِمَ و أَتَصَدَّقَ، فَيقولُ اللهُ: كَذَبْتَ ويقولُ الملائِكَةُ : كَذَبْتَ. ويقولُ اللهُ: بَلْ اَرَدْتَ اَنْ يُقَالَ فُلانٌ جَوَادٌ وقَدْ قِيلَ ذلكَ. ثُمَّ يُؤتَى بالذى قُتِلَ فى سَبيلِ اللهِ، فَيقولُ اللهُ: في ماذا قُتِلْتَ؟ فيقولُ: اَمَرْتَ بالجِهادِ فى سَبِيلكَ فَقاتَلْتُ حتى قُتِلْتُ فيقولُ اللهُ: كَذَبْتَ. ويقولُ الملائِكَةُ :كَذَبْتَ فيقولُ اللهُ: بَلْ اَرَدْتَ اَنْ يُقَالَ فلانٌ جَرِئٌ، فَقَدْ قيلَ ذلكَ. ثمَّ ضَرَبَ رسولُ اللهِ صلى الله عليه وسلمعَلَى رُكْبَتَي فقالَ: يا أبا هُرَيرَةَ أُولئِكَ الثلاثَةُ أَوَّلُ خَلْقِ اللهِ تُسْعَرُ بهمُ النَّارُ يومَ القيامَةِ.)) واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، کە خوای گەورە دێتە خوارەوە بۆ داوەری کردنی نێوان بەندەکان، هەمو نەتەوەکان لەسەر ئەژنۆ جەمن و لەوێن. یەکەمین

---

[1] ـ رواه أحمد والنسائي والحاكم وصححه الألباني في الجامع ٦٤٠١ (و).

کەس، کە بانگ دەکریٚ، کابرایەکی قورئان خویٚن و کابرایەکی کوژراو لـە پیٚنـاوی خواداو کابرایەکی دەوڵەمەندە، خوا بە کابرای قورئان خویٚن دەفەرمویٚ: ئایا ئەوەم فیٚر نەکردی، کە بۆ نیٚرراوەکەی خۆمم نارد بو؟! دەڵـیٚ: بـەڵیٚ وابـوو خوایـە، ئـەو دەفەرمویٚت: ئەدی چیت پیٚ کرد؟ دەڵیٚ: بەدەم نویٚژ کردنەوە، شەو و ڕۆژ دەمخویٚند، خـوا دەفـەرمویٚ: درۆت کـرد، ئینجـا فریـشتەکانیش دەڵـیٚن: درۆت کـرد، خـوا دەفەرمویٚ: قورئانت دەخویٚند، تا بڵیٚن فـلاٚن کـەس قورئـان خویٚنـە، ئـەوا ووتـرا! ئەوجا دەوڵەمەندی خاوەن سامان دیٚنن، خوا پیٚی دەفەرمویٚ: ئایا سامانیٚکی زۆرم پیٚ نەبەخشیت؟! وام لیٚ نەکردیت پیٚویستیت بـە کـەس نـەمیٚنیٚت؟! دەڵـیٚ: بـەڵیٚ خوایە وا بوو، خوا دەفەرمویٚ: باشە بەوەی پیٚم بەخشیت چـیت پـیٚ کـرد؟ دەڵـیٚ: یارمەتی خزمەکانم لیٚ دەدا و خیٚرو خیٚراتم لیٚ دەکرد، خوا پیٚی دەفـەرمویٚ: درۆت کرد، فریشتەکانیش دەڵیٚن: درۆت کرد، خوا پیٚی دەفەرمویٚ: خیٚروخیٚراتت دەکـرد، تا بڵیٚن فلاٚن خیٚرەو مەندە، ئەوا ووترا... ئەوجا ئەو کابرایە دیٚنن، کە لـە پیٚنـاوی خوادا کوژراوە، خوا پیٚی دەفـەرمویٚ: لـە ڕیٚـی چـیدا کوژرایـت؟ دەڵـیٚ: جـەنابت فەرمانی جیهادت لە پیٚناوی خۆتدا دا بوو، منیش چومە جـەنگ شـەڕم کـرد تـا کوژرام، خوا دەفەرمویٚ: درۆت کرد، فریشتەکانیش دەڵیٚن: درۆت کرد، پاشان خـوا دەفەرمویٚ: دەتویست خەڵکی پیٚـت بڵـیٚن ئازایـە، ئـەوا پیٚـشت ووتـرا... ئینجـا پیٚغەمبەرﷺ دەستی پیٚرۆزی کیٚشا بە ئەژنۆمدا و فەرموی: ئەبو هورەیرە! ئەو سیٚ کەسە لە ڕۆژی دواییدا یەکـەمین کەسـانیٚکن، کـە ئـاگری دۆزەخیـان پـیٚ خـۆش دەکریٚت...

با ئەوەندەی هیٚنامانەوە لەسەر باس کردنی ئەو شتانەی پیٚچەوانەی شـایەتمانن لیٚرەدا بـەس بیٚـت، چـونکە ناتوانریٚـت لیٚـرەدا هـەمویان بـاس کـریٚن، ئەمانـەی هیٚنامانەوە ڕیٚسان، دەتوانریٚت حوکمی هی تریان پیٚ بدریٚت ..

لە خوای پەروەردگاری کار جوان و زانا داوا دەکەین، کە باوەڕمان بەم ئایینە پاکە پتەو تر کات و، لەسەر ئەم ڕێبازە شیرینە پابەندترمان کات، بە تایبەتی لەم زەمانەدا، کە کوفر زاڵەو زەحمەتە زۆر کەس بیدۆزیتەوەو باوەڕی بە سەلامەتی ما بێت و یەکێك لەو خاڵانەی سەرەوە عەیبداری نەکردبێت!

بەمەش کۆتایی بە ڕوکنی یەکەم (شایەتمان) دەهێنین، چونکە ئەوەندەی باسمان کرد دەربارەی خودی شایەتمان و واتاو ناوەڕۆك و ئەو شتانەی پێچەوانەی دەبنەوەو هەڵی دەتەکێنن، لێرەدا بۆ لاوێکی موسوڵمانی سەردەم ئەوەندە بەسە... ان شاو الله...

## تەواو بوو

## والحمدلله رب العالمین

# ناوەڕۆك

سەعید حەووا ـ خوا لێی خۆشبێت ـ خۆی ئەم زنجیرە کتێبە(الله، الرسول، الاسلام)ی ناو ناوە (الاساس)، چونکە بە بناغە سەرەکیەکانی تێگەیشتنی ئیسلامی دەبینی، ئەمەش بێگومان هەر وایە، چونکە تێگەیشتنی ئەو سێ ڕوکنە سەرەکیەی باوەڕ هەموو ئیسلامەکەیان لەسەر دادەمەزرێت... ئەم زنجیرە کتێبە هەر چەندە زیاتر لە ٣٠ ساڵ بەسەر نووسین و بلاو کردنەوەیاندا تێپەڕیووە، بەڵام گرنگی و کاریگەری خۆیان هەر ماوەو، (والله اعلم) هەر دەش مێنێت .

کتێبی (الاسلام) ەکە زۆر گەورەیە، چوار بەرگی گەورەیە، ئەمەی ئێستا لەبەر دەستی خوێنەرانی بەڕێزدایە(٨٥)لاپەڕەی ئەسڵی بەرگی یەکەمە، زیاتر لە١٠٠ لاپەڕەی تری ماوە، کە دەربارەی چوار ڕوکنەکەی ترە (نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج) کە (ان شاو الله) ئەوانیش دەخەینە بەر دەست، بەڵام وامان بە باش زانی خوێنەرانی کورد لەوەی کراوە بە کوردی، بێ بەش نەکەین، بە چاوەڕوان کردنی، تا هەموو بەرگی یەکەم تەواو دەبێت...

ئازاد نجم الدین




نوسینگەی تەفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت: 2518138 -2221695 - 2230908

موبایل: 07504605122 – 07701387291

www.al-tafseer.com

E-mail: tafseeroffice@yahoo.com

altafseer@hotmail.com


بەرگ ئەمین